حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی پەروەردە

# یاسای پەروەردە و فێرکردن
## لە هەرێمی کوردستان - عێراق

2023

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی پەروەردە

# یاسای پەروەردە و فێرکردن
## لە هەرێمی کوردستان - عێراق


| | |
|---|---|
| **ئامادەکردنی:** | لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە |
| **سەرپەرشتی چاپ:** | وەزارەتی پەروەردە |
| **دیزاین:** | ئاکار جەلیل کاکەوەیس |
| **تیراژ:** | 3000 دانە |
| **چاپ:** | یەکەم (2023) |

# پێشەکی

سیستمی پەروەردە و فێربوون لە هەرێمی کوردستان لە هەموو ڕوویەکەوە، پێویستی بە ڕێکخستنەوەیەکی ورد و باش هەبوو، یەکەمین هەنگاوی گرنگیش بۆ ڕێکخستنەوە و پەرەپێدانی کەرتی پەروەردە، بوونی یاسایەکی پەروەردە و فێرکردنی هاوچەرخ بوو. بۆیەشە لەگەڵ دەستپێکی کابینەی نۆیەم، بەڕێز (مەسرور بارزانی) سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان وەزارەتمانی ڕاسپارد بۆ نووسینەوەی یاسای پەروەردە و فێربوون لە هەرێمی کوردستان. بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو یاسایەوە، بەردی بناغەی سیستمی پەروەردەیی کوردستانی دابڕێژرێت و کۆپی هیچ سیستمێکی (پەروەردەیی وەک خۆی) نەهێندرێتە کوردستان، بەڵکو سوود لە ئەزموون و پرۆسەی پەروەردەی دەوڵەتانی پێشکەوتوو

وەربگیرێـت، بەمەبەسـتی دەوڵەمەندکردنی پرۆسـەی پەروەردە لە کوردسـتان و لەهەمانکاتیشـدا گونجاو و شـیاو بێت بە دابونەریتی کوردسـتانی، هاوکات فەلسـەفە و ئامانجێکی ڕوون و ڕۆشـنی بۆ پرۆسەی پەروەردە لە دواوە بێت.

لەو ڕوانگەیەوە و بەمەبەسـتی نووسـینەوەی ڕەشنووسی یاسای پـەروەردە، لەگـەڵ شـارەزایان و پەروەردەکارانـی نـاو وەزارەت و دەرەوەی وەزارەت، هەمـوو هەوڵەکانمـان چـڕ کردنـەوە، پاش دوو سـاڵ گفتوگۆکـردن و دەیـان کۆبوونـەوەی لیژنـەی پەیوەندیـدار و کۆبوونەوەی ئەنجومەنـی وەزارەتی پەروەردە و چەندین کۆبوونەوە لەگەڵ ئەنجومەنی شـورای هەرێم و لیژنەی پـەروەردەی پەرلەمانی کوردسـتان، ڕەشنووسـی یاسـاکە ئاراسـتەی ئەنجومەنـی وەزیران کـرا و لـە کۆبونەوەی ژمـارە ( 72 ) لـە (8/12/2021) بە کۆی دەنگ پەسەندکرا.

دواتریـش نێردرایـە پەرلەمانـی کوردسـتان و لەوێـش یـازدە (11) کۆبوونەوەی گشتیی لەنێو هۆڵی پەرلەمانی کوردستان لەبارەیەوە ئەنجامـدران و پـاش خوێندنـەوەی یەکـەم و دووەم و دەنگـدان لەسـەر مادده بە ماددەی یاساکە، ئاراستەی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردسـتان کرا، پـاش واژۆکردنـی لەلایەن بەڕێز سـەرۆکی هەرێمی کوردسـتانەوە، لـە 27ی 2ی 2023 لـە وەقائعـی کوردسـتان بڵاوکرایەوە و کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە.

لـە ڕۆژی پێنجشـەممە 30ی 3ی 2023 ئەنجومەنـی وەزارەتـی پـەروەردە کۆبوونـەوی ئاسـایی خـۆی تایبەت بە یاسـای پـەروەردە و فێرکـردن لـە هەرێمـی کوردسـتان ئەنجامـدا و چەندیـن بڕیـاری پێویسـت دران بـۆ پێکهێنانـی لیژنـەی تایبەتمەند بـە ئامادەکردنی پەیـڕەو و ڕێنمایی و ئەرکە هەنوکەییـەکان، کە لەگەڵ کەوتنە بواری

جێبەجێکردن پێویستیان بە کارکردن هەیە.
سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی پاڵپشت و هاوکار بوون لە نووسینەوە و دەوڵەمەندکردن و دەنگدان و پەسەندکردنی یاسای ژمارە (13)ی ساڵی 2022, یاسای پەروەردە و فێرکردن لە هەرێمی کوردستان-عێراق.

ئالان حمه سعيد صالح
وەزیری پەروەردە
مایسی 2023

**کۆماری عێراق**

**هەرێمی کوردستان**

**سەرۆک**

**بڕیار**

**ژمــارە (2)ی ساڵی 2023**

بەپێی ئەو دەسـەڵاتەی پێماندراوە لە بڕگەی (یەکەم)ی ماددەی (دەیـەم) لـە یاسـای سـەرۆکایەتیی هەرێمـی کوردسـتان ژمـارە (1)ی سـاڵی 2005ی هەموارکـراو و پاڵپشـت بـە یاسـاکاریی پەرلەمانی کوردستان کە لە دانیشتنی ئاسایی ژمارە (12)ی ڕۆژی 15/11/2022 کردوویەتی، بڕیارماندا بە دەرکردنی:

**یاسای ژمارە (13)ی ساڵی 2022**

**یاسای پەروەردە و فێرکردن لە هەرێمی کوردستان – عێراق**

# دەروازەی یەکەم

# پێناسە، ئامانج، بنەما فەلسەفی و گشتییەکانی پەروەردە و فێرکردن



# بەشی یەکەم
# پێناسەکان

**ماددەی (1):**

بۆ مەبەستی حوکمەکانی ئەم یاسایە، ئەم زاراوە و دەستەواژانەی خوارەوە ماناکانی بەرامبەریان دەگەیەنن:-

**یەکەم:** هەرێم: هەرێمی کوردستان - عێراق.

**دووەم:** ئەنجومەنی وەزیران: ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم.

**سێیەم:** وەزارەت: وەزارەتی پەروەردەی هەرێم.

**چوارەم:** وەزیر: وەزیری پەروەردەی هەرێم.

**پێنجەم:** ئەنجومەنی وەزارەت: ئەنجومەنی وەزارەتی پەروەردەی هەرێم.

**شەشەم:** ئەنجومەنی پەروەردە: ئەنجومەنی پەروەردەی پارێزگا، ئیدارە سەربەخۆکان و قەزاکان.

**حەوتەم:** بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە: بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکانی پەروەردەی پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکان.

**هەشتەم:** بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە: بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی ناوەندی پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکان و قەزاکان.

**نۆیەم:** قۆناغی باخچە: قۆناغی شیاندن و ڕاهێنان و ئامادەکردنە بۆ منداڵانی تەمەن (4) چوار ساڵ و (5) پێنج ساڵ بەر لە خوێندنی بنەڕەتی و پەروەردەی پێشوەخت بۆ منداڵی خاوەن پێداویستی تایبەت لە هەمان تەمەندا دەگرێتەوە.

**دەیەم:** خوێندنی پەیڕەوکراو: ئەو خوێندنەیە کە لە قوتابخانە، خوێندنگە، کۆمەڵگەی پەروەردەیی و پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییەکان لە تەمەنی یاسایی قوتابیان و خوێندکاراندا پەیڕەو

دەكرێت.

**یازدەیەم:** خوێندنی پابەندكراو: قۆناغی خوێندنی بنەڕەتی دەگرێتەوە، تێیدا بەخێوكار پابەند دەبێت، كە لە تەمەنی یاساییدا منداڵ لە یەكێک لە قوتابخانەكان بخاتە بەر خوێندن.

**دوازدەیەم:**

1 - خوێندنی بنەڕەتی: یەكەم قۆناغی خوێندنی پەیڕەوكراو و پابەندكراوە كە (9) نۆ پۆلی خوێندن لەخۆدەگرێت.

2 - قوتابخانەی بنەڕەتی: ناوەندی خوێندنی قۆناغی بنەڕەتییە.

**سیازدەیەم:**

1 - خوێندنی ئامادەیی: ئەو قۆناغەی خوێندنە كە دوای قۆناغی بنەڕەتی دەستپێدەكات و لە (3) سێ پۆلی خوێندن پێكدێت، كە پۆلەكانی دەیەم تا دوازدەیەم لە خۆ دەگرێت.

2 - خوێندنگەی ئامادەیی: ناوەندی خوێندنی قۆناغی ئامادەییە.

**چواردەیەم:** خوێندنی پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی: قۆناغی خوێندنی پیشەییە، كە دوای خوێندنی بنەڕەتی دەستپێدەكات و لە (5) پێنج پۆلی خوێندن پێكدێت.

**پازدەیەم:** پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی: ئەو ناوەندەیە، كە خوێندنی پیشەیی بۆ ماوەی (5) پێنج ساڵ، پاش تەواوكردنی قۆناغی بنەڕەتی تێدا بەڕێوەدەچێت.

**شازدەیەم:** كۆمەڵگەی پەروەردەیی: ئەو دامەزراوەیەیە، كە باخچەی منداڵان و قۆناغەكانی خوێندنی بنەڕەتی و ئامادەیی لەخۆدەگرێت.

**حەڤدەیەم:** دامەزراوە: دامەزراوەی پەروەردەیی و فێركردنە، كە باخچەی منداڵان، قوتابخانە، خوێندنگە، كۆمەڵگە و پەیمانگە پەروەردەییەكان، بە حكومی و ناحكومی و هاوبەشەوە دەگرێتەوە.

**هەژدەیـەم:** دامـەزراوەی پەروەردەیـی حکومـی: ئـەو دامەزراوانەی پـەروەردە و فێرکـردن دەگرێتەوە، کـە مۆڵکی حکومەتـن و لەلایەن وەزارەتەوە، بەڕێوەدەبرێن و خەرجیان لێدەکرێت.

**نۆزدەیـەم:** دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومی: ئـەو دامەزراوانەی پـەروەردە و فێرکـردن دەگرێتـەوە، کـە مۆڵکـی کـەس و لایەنـی پەروەردەکاریـی ناحکومیـن و لەلایـەن ئەوانـەوە بەڕێـوە دەبرێـن و خەرجیان لێدەکرێت.

**بیسـتەم:** دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومـی قازانـج نەویسـت: ناوەنـدی پـەروەردە و فێرکـردنی ناحکومـی خـاوەن کەسـێتی مەعنەوییە، لە دامودەزگاکانی حکومی پەیوەندیدار تۆمار دەکرێت، قازانجـی کارکـردنی تەنهـا بـۆ دابینکـردنی پێداویسـتییە زانسـتی و کارگێڕییەکان و پەرەپێدانی توانای منـداڵان، قوتابیان، خوێندکاران، مامۆسـتایان و کارمەنـدانی دیکـەی دامەزراوەکـە دەبێـت و بـۆ سوودی کەسی بەکارناهێنرێت.

**بیسـت و یەکـەم:** دامـەزراوە هاوبـەش و پشـتیوانکراوەکان: ئـەو دامەزراوانەی پەروەردە و فێرکـردن دەگرێتەوە کە مۆڵکی حکومەتن و تێچووەکانیان لەلایەن حکومەتەوە دابین دەکرێت، بەڵام لەلایەن کەسـانی پەروەردەیـی نیشـتمانی یان بیانییـەوە، بـە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەت بەڕێوەدەبرێن.

**بیست و دووەم:**

1 - قوتابـی: ئـەو کەسـەیە کە لـە قوتابخانـەی بنەڕەتـی ناونووس کراوە و بەردەوامە لە خوێندن.

2 - خوێندکار: ئەو کەسـەیە کە لە خوێندنگەی ئامادەیی یان بەشی ئامادەیـی کۆمەڵگەی پەروەردەیـی یان پەیمانگەکانـی پەروەردەیی پیشەیی ناونووس کراوە و بەردەوامە لە خوێندن.

**بیست و سێیەم:** پۆل: ساڵێکی خوێندنی قوتابی و خوێندکارە لە هەرقۆناغێکی خوێندندا.
**بیست و چوارەم:** قوتابخانەی ئێواران: ناوەندی خوێندنی ئێوارانی حکومییە، بۆ ئەو قوتابی و خوێندکارانە تەرخانکراوە، کە بەهۆی دەرنەچوونی دوو ساڵ لەسەریەک لە خوێندنی ڕۆژ، یاخود بەهۆی تێپەڕبوونی تەمەنی یاساییان مافی بەردەوامبوونیان لە قوتابخانەی بنەڕەتی و ئامادەیی ڕۆژ نییە.
**بیست و پێنجەم:** مامۆستا: پێشەنگی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنە، شیاو و لێهاتووە، بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە ئەو مەرج و کارامەییانەی تێدا دەستەبەرە، کە بۆ مەبەستی وانە وتنەوە و پێشەنگی لە دامەزراوەکاندا پێویستە.
**بیست و شەشەم:** مامۆستای پەروەردەی تایبەت: مامۆستای پسپۆرە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵانی خاوەن پێداویستی تایبەت، لە پرۆسەی پەروەردەی پیشوەختی قۆناغی باخچە لە دامەزراوە پەروەردەییەکاندا .
**بیست و حەوتەم:** بەڕێوەبەری دامەزراوە: ئەو کەسەیە کە ئەرکی بەڕێوەبردنی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی و فێرکردنی پێ دەسپێردرێت.
**بیست و هەشتەم:** یاریدەدەری بەڕێوەبەر: ئەو کەسەیە کە ئەرکی یاریدەدەری بەڕێوەبەری پێدەسپێردرێت.
**بیست و نۆیەم:** ڕێنماییکاری پەروەردەیی: ئەو فەرمانبەرەیە، کە خاوەن پسپۆڕییە لە یەکێک لە بوارەکانی دەروونناسی، کۆمەڵناسی، ڕێنماییکردنی پەروەردەیی، یان کاری کۆمەڵایەتی، یان هەر پسپۆڕییەکی دیکەی هاوشێوە و ئەرکی ڕێنماییی دەروونی و پەروەردەیی و هۆشیاری کۆمەڵایەتی لە دامەزراوەکاندا لە

ئەستۆ دەگرێت، بۆ چارەسەری کێشە دەروونی، کۆمەڵایەتی، یان ڕەفتارییەکانی قوتابیان و خوێندکاران ڕادەسپێردرێت.

**سییەم:** سەرپەرشتیاری پەروەردەیی: ئەو فەرمانبەرەیە کە بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە، ئەرکی ڕێنمایی، بەدواداچوون و هەڵسەنگاندن، لە دامەزراوەکاندا لە ئەستۆ دەگرێت.

**سی و یەکەم:** پلانی فێرکردن: دیدگا گشتیەکانی پەروەردە و فێرکردنە، کە لە بنەما گشتی و فەلسەفییەکانی پەروەردە وفێرکردنی هاتوو لەم یاسایەدا سەرچاوە دەگرێت و بەها و بنەماکانی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنی لەسەر بنیاتدەنرێت.

**سی و دووەم:** کتێبەکانی خوێندن: کتێبەکانی خوێندنی هەر بابەتێکە، کە وردەکارییەکەی لە پلانی فێرکردنەوە سەرچاوەی گرتووە.

**سی و سێیەم:** پرۆگرامی خوێندن: بەشێکە لە پلانی فێرکردن، کە پەیوەستە بە پۆلێک، یاخود بازنەیەکی خوێندنی دیاریکراو، کتێبەکانی خوێندن لە هەر بابەتێک لە قۆناغی یان بازنەی پەیوەندیدار، کتێبەکانی ڕاهێنان و ڕێبەری مامۆستا و ڕێبەری سەرپەرشتیاری پەروەردەیی، سیستەمی تاقیکردنەوەکان و هەڵسەنگاندن لەخۆدەگرێت.

**سی و چوارەم:** بەخێوکار: ئەو کەسەی بەخێوکردن و چاودێریکردنی منداڵ، قوتابی و خوێندکار، بە پێی یاسا بەرکارەکان لە ئەستۆ دەگرێت.

**سی و پێنجەم:** ئەنجومەنی بەخێوکاران: ئەو ئەنجومەنەیە کە بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە لە ناوەندەکانی خوێندن لەلایەن بەخێوکارانەوە پێکدەهێنرێت.

**سی و شەشەم:** پەروەردەی تایبەت: بریتیە لە کۆمەڵێک بەرنامەی

پەروەردەیـی تایبـەت، کە دەبێت بۆ قوتابیـان و خوێندکارانی خاوەن پێداویسـتیی تایبـەت دابیـن بکرێت، بـۆ گەشـەکردن و پەرەپێدانی تواناکانـی خوێندنیان، لە ڕێگەی ئـەو هۆکارانەی خوێندن کە لەگەڵ تواناکانیاندا دەگونجێت.

**سی و حەوتەم:** قوتابیان و خوێندکارانی خاوەن پێداویستی تایبەت: ئەو قوتابی و خوێندکارانەن کە بە هۆکارێکی تەندروستی، دەروونی یـان فیزیکی، بەبێ بایەخپێدانی تایبەت ناتوانن چالاکییە ڕۆژانەکانی پرۆسەی خوێندن هاوشێوەی هاوپۆلەکانیان، ڕایی بکەن.

**سی و هەشتەم:** پەروەردە و فێرکردن: ئەو پرۆسەیەیە کە بەپێی پلانی فێرکـردن و پرۆگرامـەکان، لەژێـر چاودێری مامۆسـتا، بەمەبەسـتی بەهرەمەندبوونـی قوتابـی و خوێندکاران بە زانسـت و تێگەشـتن و بنیاتنانی بەهاکان، هاوتەریبی خوێندنەوەی ڕەخنەگرانەی دەقەکان، لە دامەزراوە پەروەردەییەکاندا بەڕێوەدەچێت.

**سـی و نۆیەم:** بەشـە وانـە: پرۆسـەیەکی پەروەردەیـی و فێرکردنە، لـە پۆل و لەژێر سەرپەرشـتی مامۆسـتا و لە ماوەیەکـی دیاریکراودا بەڕێوە دەچێت.

**چـل:** دڵنیایـی جـۆری: ئـەو ڕێکارانەیـە کە لـە پرۆسـەی پـەروەردە و فێرکـردن لە دامـەزراوە پەروەردەییەکاندا بۆ هێنانـەدی ئامانجەکانی ئەم یاسایە دەگیرێتەبەر.

**چل و یەکەم:** خوێندنی خێرا: ئەو خویندنەیە کە ئامانجی ڕەخساندنی هەلی فێربوونە بۆ ئەوانەی لە تەمەنی یاساییدا لە خوێندن بەردەوام نەبـوون، یان هـەر پەیوەندیان بە قوتابخانەوە نەکـردووە، لە ڕێگەی ئامادەکردنیـان لە ماوەی (٥) پێنج سـاڵ یان زیاتر، بـۆ ئەوەی بەپێی تەمەنەکانیان بگەنەوە سەر ڕێچکەی خوێندنی پەیڕەوکراو.

**چل و دووەم:** نەهێشـتنی نەخوێندەواریی: بنیاتنانی توانسـتەکانی

خوێندنەوە و نووسین و بنەماکانی ژمارەکارییە، بۆ ئەو کەسەی کە هەر نیەتی و تەمەنیشی لە (16) شازدە ساڵ زیاترە.

**چل و سێیەم:** شوێنی حەواندنەوەی قوتابیان: ئەو شوێنانەن کە لە دوای تەواوبوونی دەوامی فەرمی قوتابخانەکان دەکرێنەوە، بۆ ئەو قوتابیانەی تەمەنیان لە (14) چواردە ساڵ کەمترە و بەهۆی کاری بەخێوکاریان ناتوانن لە کاتی تەواوبوونی دەوامی قوتابخانە ڕاستەوخۆ بڕۆنەوە ماڵەوە.

**چل و چوارەم:** دیداری گەشە: بریتیە لە دیدارێک کە لە قوتابخانە و خوێندنگە بە ئامادەبوونی مامۆستا، بەخێوکار و قوتابی یان خوێندکار بۆ تاوتوێکردنی باری خوێندن و بەمەبەستی دروستکردنی لێکتێگەیشتنی هاوبەش بۆ پەرەپێدانی تواناکانی قوتابی و خوێندکار و باشترکردنی بارودۆخی خوێندنیان، ئەنجام دەدرێت.

**چل و پێنجەم:** قوتابخانە و خوێندنگەی بەهرەداران و تایبەتمەند: بریتییە لە قوتابخانە و خوێندنگەی بەهرەداران، یان تایبەتمەند بە هونەر، یان وەرزش، یان هەر بابەتێکی دیکە، کە وەزارەت ڕەزامەندی لەسەر کردنەوەیان دەدات.

**چل و شەشەم:** مۆڵەت: ئەو ڕێگەپێدانەیە کە لەلایەن وەزارەتەوە و بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە و ڕێنماییەکانی، بە دروستکردنی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی دەدرێت.

# بەشی دووەم
# بنەما گشتی و فەلسەفییەکانی
# پەروەردە و فێرکردن

### تەوەری یەکەم
### بنەما فەلسەفییەکانی پەروەردە و فێرکردن
### ماددەی (2):

**یەکـەم:** پـەروەردە و فێرکـردن میکانیزمـی تواناسـازی و بنیاتنـەری تاکێکی کوردسـتانی خوێندەوار و هۆشـیار و داهێنەرە، بە ئاراستەی گەشەپێدانی کۆمەڵگەیەک کە پرنسیپەکانی دیموکراتی، بنەماکانی دادپـەروەری کۆمەڵایەتی و یەکسـانی نێوان هـەردوو ڕەگەز، گیانی پێکـەوە ژیانی ئاشـتییانە و مرۆڤدۆسـتی و خۆشەویسـتی خاک و پاراستنی ژینگەی تێیدا گەشە بکات.

**دووەم:** قوتـابی و خوێنـدکار تاکـی خـاوەن خواسـتی فێربـوون و توانسـتی و شـیکردنەوە و ڕەخنەگرتنـن، توانـای تێگەیشـتن و قبوڵکـردنی دیدوبۆچـوونی جیاواز و گوزارشـت لە خۆکـردنی ئازاد و بوێرانەیـان هەیە، ئامـادەن بۆ کارکردنی داهێنەرانـە و جێبەجێکردنی کارامەییە بنەڕەتییەکان و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی لە داهاتوودا.

**سـێیەم:** گەشـەپێدانی گیـانی ڕێزگرتـن لـە بەهـا نەتەوەیـی و کۆمەڵایەتییـە باڵاکانـی کۆمەڵگـەی کوردسـتانی لـە پرۆسـەی پـەروەردە و فێرکـردن و ڕاهێنانی قوتابی و خوێندکار لەسـەر متمانە بەخۆبوون و داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان لـە چوارچێـوەی دەسـتوور و یاسـا کارپێکـراوەکان و بەڵگەنامـە نێودەوڵەتییە پەسەندکراوەکاندا.

## تەوەری دووەم
## بنەما گشتییەکانی پەروەردە و فێرکردن

**ماددەی (3):**

**یەکـەم:** فێربـوون مافێکـی دابینکـراو و بەخۆڕاییـە لـە سـەرجەم دامـەزراوە پەروەردەییـە حکومییەکانـدا، نابێـت هیـچ تاکێـک کـە مەرجەکانی هاتوو لەم یاسایەی تێدابێت لەو مافە بێبەش بکرێت.

**دووەم:** زمانـی کـوردی زمانـی فەرمیـی خوێندنـە لـە سـەرجەم دامەزراوەکانـدا، جگـە لـەو دامەزراوانەی کە تایبەتن بـە پێکهاتەکان وەک تورکمان، سریان کلدان ئاشوور، ئەرمەن و عەرەب کە خوێندن تێیانـدا بە زمانی دایک دەبێت، لەگەڵ ئـەو دامەزراوانەی، کە بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە مۆڵەتیان پێدراوە بە زمانێکی دیکە بخوێنن.

**سـێیەم:** قوتابی و خوێندکار بە چەقی هەردوو پرۆسـەی خوێندن و فێرکردن هەژمار دەکرێن.

**چوارەم:** مامۆستا پێشەنگی سەرەکییە بۆ پەروەردە و هاندانی گیانی فێربوون و داهێنان و گەیاندنی زانیاری و توانستە جۆراوجۆرەکان بە قوتابیـان و خوێندکاران و پێویسـتی بە پەرەپێدانـی خودی بەردەوام هەیە و دەبێت شکۆی پارێزراو بێت.

**پێنجـەم:** بەکارهێنانی توندوتیژیی جەسـتەیی و دەروونی و هەموو جۆرەکانـی جیاکاریـی و خـراپ مامەڵەکـردن لـە دامەزراوەکانـدا، قەدەغەیە.

**شەشـەم:** پرۆسـەی پەروەردە و فێرکردن لە دامەزراوە پەرەوەردەییە حکومیەکانـدا، لەسـەر هەمـان سیسـتم و بەهـا و میکانیـزم بەڕێوەدەچێت.

**حەوتـەم:** وەرگرتنـی هەر بـڕە پارەیەک لـە قوتابیان و خوێنـدکاران و کەسوکاریان لەلایەن قوتابخانە و خوێندنگە و پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییە حکومیەکان، بەمەبەستی خوێندن، قەدەغەیە.

**هەشـتەم:** وەزارەت سیسـتمی شـۆڕکردنەوەی دەسـەڵاتەکان لـە بەڕێوەبەردنـدا، بـۆ مەبەسـتی پێـدانی دەسـەڵاتی زیاتـر بـە بەڕێوەبەرایەتی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان پیادە دەکات.

# بەشی سێیەم
# ئامانجە گشتی و هاوبەشەکانی
# پەروەردە و فێرکردن

**ماددەی (4):**

**یەکـەم:** فێرکـردن و گەشـەپێدان و بنیاتنانـی توانـاکانی نەوەیەکـی بەهرەمەند بە زانست.

**دووەم:** بنیاتنانی هەسـتی پابەندبوون لە تاکدا، بە جۆرێک کە شـانازی بە نیشتمان و مێژوو و کولتووری کوردستانی خۆی بکات و لە بنیاتنانی وڵاتەکەیدا بەشدار بێت.

**سـێیەم:** پەرەپێدانـی بەهاکانـی دیموکـراسی، ئاشـتی، پێکەوەژیانـی ئاشـتیانە، یەکسانیی نێوان هەردوو ڕەگەز، ڕێزگرتنی ئایین و نەتەوەکان، ئازادیی تاک، مافەکانی مرۆڤ و پاراستنی ژینگە.

**چـوارەم:** گەشـەپێدانی توانسـتەکانی قوتابـی و خوێنـدکار، تـا بـبن بە هاونیشـتمانییەکی خوێنـدەوار، داهێنـەر، چالاک، خاوەن هۆشـیاری و کەسایەتی سەربەخۆ.

**پێنجەم:** گەشـەپێدانی توانای نەوەکان بۆ ئامادەکردنیان تا بەشداری لە ژیانی گشتی کۆمەڵگە و بازاڕی کار و پێشکەوتنی هەرێمدا بکەن.

**شەشـەم:** ئامادەکردن و هاندانی قوتابیان و خوێندکاران تا بەردەوام بن لە خوێندن لە قۆناغی بەرزتردا.

**حەوتـەم:** گرنگیـدان بـە پـەروەردەی وەرزشـی و هونـەری و جەسـتەیی قوتابیان و خوێندکاران.
**هەشـتەم:** کارکردن بۆ نەهێشـتنی نەخوێندەواریی و ڕەخساندنی هەلی فێربوون و گەڕاندنەوەی دابڕاوان بۆ ناوەندەکانی خوێندن.
**نۆیەم:** هێنانەئارای کۆمەڵگەیەک کە بڕوای بە ئاوێتەکردنی پەروەردەیی کەسـانی خـاوەن پێداویسـتی تایبـەت هەبێـت، بەپێـی بنەماکانـی یەکسانی، بۆ ئەوەی فێرکردنێکی ئاست بەرزیان بۆ دابین بکرێت.
**دەیـەم:** بەهێزکردنی تواناکانـی قوتابیان و خوێندکاران بـۆ بیرکردنەوەی زانسـتی، ئەنجامدانـی توێژینـەوە و تاقیکردنـەوەکان، بەکارهێنانـی سەرچاوەی زانستی و تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو.
**یازدەیـەم:** هەوڵـدان بـۆ ڕاهێنانـی قوتابـی و خوێندکار لەسـەر شـێوازە هاوچەرخەکانی خوێندن و پەرەپێدانی توانسـتی پیشـەیی خوێندکاران و ئامادە و مەشـقپێکردنیان، بە ئاراسـتەی گونجاندنـی تواناکانیان لەگەڵ پیشەیەکی دیاریکراوی پێویست لە بازاڕی کاردا.

## بەشی یەکەم
## باخچەی منداڵان

---

## تەوەری یەکەم
## بنەماکان

**ماددەی (5):**

باخچەی منداڵان قۆناغێکی ئارەزوومەندانەیە، (2) دوو ساڵ بەر لە خوێندنی بنەڕەتی دەستپێدەکات، منداڵان بۆ خوێندنی بنەڕەتی ئامادە دەکات و هەموو ئەو منداڵانەی تێدا وەردەگیرێن، کە لە ڕۆژی دەستپێکردنیان لە باخچە، یان ڕۆژی (31)ی کانونی یەکەمی ئەو ساڵە، تەمەنیان گەیشتبێتە (4) چوار یان (5) پێنج ساڵ.

## تەوەری دووەم
## ئامانجە تایبەتییەکانی باخچەی منداڵان

**ماددەی (6):** ئامانجە تایبەتییەکانی باخچەی منداڵان بریتین لە:-

**یەکەم:** کارکردن بۆ گەشەپێدانی کەسێتی منداڵ، بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ منداڵانی دیکە لە ژینگەی دەرەوەی بازنەی خێزان و پیادەکردنی چالاکی پەروەردەیی چێژبەخش و فێرکردنی سوودبەخش.

**دووەم:** بەدەستهێنانی بنەما بەراییەکانی خوێندنەوە و نووسین و ژماردن، هاندانی هەستی جوانناسی و هونەر و پەرەپێدانی کارامەیی جەستەیی.

**ماددەی (7):**

وەزارەت باخچەی منداڵانی نوێ دەکاتەوە و پشتیوانی پەرەپێدانی باخچەی منداڵان دەکات و کەرتی تایبەت بۆ کردنەوەی باخچەی منداڵانی ناحکومی هاندەدات.

**ماددەی (8):**

**یەکەم:** پێویستە ژمارەی منداڵان لە هەر پۆلێک لەگەڵ ڕووبەری پۆلەکەدا گونجاو بێت و ژینگەیەکی لەباری تێدا دەستەبەر بکرێت.

**دووەم:** ئەگەر باخچەی منداڵان یەک دەوام بوو دەبێت دەوامی ڕۆژانەی لە شەش کاتژمێر کەمتر نەبێت، ئەگەر دوو دەوام بوو دەبێت دەوامی ڕۆژانەی باخچە لە پێنج کاتژمێر کەمتر نەبێت.

## بەشی دووەم
## خوێندنی بنەڕەتی

---

## تەوەری یەکەم
## بنەماکانی خوێندنی بنەڕەتی

**ماددەی (9):**

**یەکـەم:** هـەر منداڵێـک لـە ڕۆژی (31)ی کانـوونی یەکـەم تەمەنی بگاتـە (6) شـەش سـاڵ، پێویسـتە لەلایـەن بەخێوکارەکەیـەوە لـە قوتابخانەیەکی بنەڕەتی بخرێتە بەر خوێندن.

**دووەم:** خوێندنی بنەڕەتی پەیڕەوکراو، بۆ هەموو تاکێک کە تەمەنی (16) شـازدە سـاڵی تەواو نەکردبێت پابەندکراوە و پێویستە قوتابی پێش ئەوەی تەمەنی (19) نۆزدە سـاڵی تێپەڕبـکات ئەو خوێندنەی تەواوکردبێت.

## تەوەری دووەم
## ئامانجەکانی خوێندنی بنەڕەتی

**ماددەی (10):**

**یەکەم:** بنیاتنانی بنەماکانی پەروەردە، خوێندن، نووسـین و ژماردن لای قوتابیـان و پەرەپێـدانی کارامەییـە سـەرەکیەکانیان، بەتایبەت کارامەیی زمانزانی، ژماردن، هونەر، جووڵە و چالاکی زانستی.

**دووەم:** فێرکـردنی بنەمـاکانی هاونیشـتمانی بـوون، مەدەنیەت، لێبووردەیـی و قبووڵکـردنی جیـاوازی، هانـدانی قوتابیـان بـۆ بەهێزکردنی توانسـتی دەستپێشخەری، کۆششکردن، پشوودرێژی و پاراستنی بەها باڵاکانی ڕەوشت و ڕەفتار.

## تەوەری سێیەم
## خوێندنی پابەندکراو

**ماددەی (11):**

**یەکـەم:** هیـچ بەخێوکارێـک مـافی ئـەوەی نییـە کـە ڕێگـە لـە خسـتنەبەر خوێندنی منـداڵ لـە قوتابخانەیەکی خوێنـدنی بنەڕەتی و بەردەوامبوون تێیدا، بگرێت، تەنها بە پاسـاوی تەندروسـتی و لە ڕێگەی ڕاپۆرتی پزیشـکی پەسـەندکراو لەلایەن لیژنەی تەندروسـتی تایبەتمەنـدەوە نەبێـت و هـەر ڕاپۆرتێکیـش تەنهـا بـۆ یەک سـاڵی خوێندن کاری پێدەکرێت و دەبێت ساڵانە نوێ بکرێتەوە.

**دووەم:** هـەر بەخێوکارێک، بەدەر لـە حوکمی بڕگەی (یەکەم)ی ئەم ماددەیـە، ڕێگە لە چوونە بەر خوێندن، یان بەردەوامبوونی خوێندنی منداڵێـک بگرێـت، دوای ئاگادارکردنەوەی بۆ یەکجـار و پابەندکردنی بـە نـاردنی منداڵەکـە بـۆ قوتابخانە، بـە پێبژاردنێـک کـە بڕەکەی لە (500.000) پێنـج سـەد هەزار دینـار کەمتر نەبێت سـزا دەدرێت، لە کاتی دووبارەکردنـەوەی سـەرپێچییەکە، سـزاکەی دەبێـت بـە دوو هێندە، بە ڕەچاوکردنی هەر سـزایەکی توندتر کە لە یاسا بەرکارەکانی هەرێمدا هاتووە.

## تەوەری چوارەم
## بازنەکانی قۆناغی خوێندنی بنەڕەتی

**ماددەی (12):**

**خوێندنی بنەڕەتی لە سێ بازنەی خوێندن پیکدێت:-**

**یەکـەم:** بازنـەی یەکەم کـە پۆلەکانی یەکـەم، دووەم و سـێیەم لە خۆدەگرێت، قوتابخانە بە پەیڕەوکردنی سیسـتمی مامۆستای پۆل

پابەندە، قوتـابی لە هەر بابەتێکی خوێندندا کارتی هەڵسـەنگاندنی پێدەدرێت و دەرنەچوون لەم بازنەیەدا بوونی نابێت.

**دووەم:** بازنـەی دووەم کـە پۆلـەکانی چوارەم، پێنجەم و شەشـەم لە خۆدەگرێت، تێیدا سیسـتمی مامۆسـتای بابەت پیادە دەکرێت، هـەر بابەتێکی خوێنـدن لەلایەن مامۆسـتای پسـپۆڕی بابەتەکەوە دەوترێتـەوە، قوتابیـان کارتی نمرەیـان پێدەدرێـت و دەرنەچـوون لە هەمان پۆل بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە، بوونی دەبێت.

**سـێیەم:** بازنەی سـێیەم کە پۆلەکانی حەوتەم، هەشـتەم و نۆیەم لە خۆدەگرێت، تێیدا سیسـتمی مامۆسـتای بابەت پیادە دەکرێت، قوتابیـان کارتی نمرەیـان پێدەدرێـت و دەرنەچـوون لـە هەمان پۆل بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە، بوونی دەبێت.

## بەشی سێیەم
## خوێندنی ئامادەیی

---

## تەوەری یەکەم
## بنەماکانی خوێندن

**ماددەی (13):**
دوای تێپەڕاندنـی قۆناغـی خوێندنی بنەڕەتی لـە هەموو بابەتەکانی خوێنـدن بەسـەرکەوتوویی، قوتابـی مافـی هەیـە پەیوەنـدی بـە قۆناغی خوێندنی ئامادەیی حکومی بێ بەرامبەر بکات، بە مەرجێک تەمەنی لە (20) بیسـت ساڵ تێپەر نەکات و پێویستە خوێندکار بەر لە تێپەڕبوونی تەمەنی (24) بیست و چوار ساڵی، قۆناغی خوێندنی ئامادەیی تەواو کردبێت.

## تەوەری دووەم
## ئامانجەکانی خوێندنی ئامادەیی

**ماددەی (14):**
**یەکـەم:** بەهێزکردنـی توانسـتی خوێنـدکار لـە ڕووی بیرکردنـەوە، توێژینـەوە، تاقیکردنـەوە، بەکارهێنانـی سـەرچاوە زانسـتییەکان و شـێوازە هاوچەرخـەکانی خوێنـدن و تەکنەلۆژیـای پێشـکەوتوو و هانـدانی بـۆ ئـەوەی ئازادانـە کار و کۆشـش و هەماهەنگی لەگەڵ کەسانی دیکەدا بکات.
**دووەم:** بنیاتنانـی کەسـێتی خوێنـدکار لـە ڕێگـەی پرۆگـرام و پلانی تایبەتـەوە، بـۆ بەشـداریکردنی ئەرێنـی لـە ژیـانی کۆمەڵایەتیـدا و قبووڵکردنی جیاوازی و پێکەوەژیانی و ئاشتییانە.

**سـێیەم:** گەشـەپێدانی توانسـتی پیشـەیی خوێنـدکارانی بەشـە پیشەییەکان و ئامادەکردن و مەشقپێکردنیان بۆ بازاڕی کار.

## تەوەری سێیەم
## بەشەکانی خوێندنی ئامادەیی

**ماددەی (15):**

**یەکەم:** قۆناغی خوێندنی ئامادەیی لە بەشـەکانی زانستی، وێژەیی و پیشـەیی پێکدێـت و پسـپۆڕییەکانی بـەشی پیشـەیی بەپێـی پێویسـتی بازاڕی کار و پسـپۆڕییەکانی بەشی زانسـتی و وێژەیی بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانسـتی، لەلایەن ئەنجوومەنی وەزارەت بڕیاری لێدەدرێت.

**دووەم:** ئەنجومـەنی وەزارەت دەتوانێـت بەپێـی پێویسـتی، خوێندنگەی ئامادەیی پیشـەیی حکومی بۆ پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی (5) پینج ساڵە بگۆڕێت.

**سێیەم:** خوێندکاری ئامادەیی مافی گۆڕینی بەشەکەی بۆ بەشێکی دیکە هەیە، ئەگەر مەرجەکانی بەشە نوێکەی تێدابێت و ئامادەبێت سەر لە نوێ گشت پۆلەکانی ئەو بەشە بخوێنێتەوە.

# تەوەری چوارەم
# پڕۆژەی ئامادەیی و تەواوکردنی خوێندن

**ماددەی (16):**

**یەکـەم:** خوێندکاری پۆلـی یازدەیەمی ئامادەیی زانسـتی و وێژەیی، دەبێت پرۆژەیەکی زانسـتی، یان وێژەیی، یان کۆمەڵایەتی، بە ناوی پرۆژەی ئامادەیی، ئەنجام بدات.

**دووەم:** ئەو خوێندکارەی زانستی و وێژەیی، کە پرۆژە ئەنجام نادات، یاخـود نمرەی خوار (50%) پەنجا لە سـەد لە پرۆژەکەی وەردەگرێت، بە دەرنەچوو هەژمار دەکرێت.

**سـێیەم:** خوێنـدکاری پۆلـی یازدەیەمی پیشـەیی لە جیاتـی پرۆژەی ئامادەیی، دەبێت بەشـداری لە خولێکی ڕاهێنان لە بوارەکەی خۆیدا بکات، کە لە (14) چواردە ڕۆژی پشووی هاوین کەمتر نەبێت.

**ماددەی (17):**

بـۆ تێپەڕکردنـی قۆناغـی خوێندنـی ئامادەیـی، دەبێـت خوێنـدکار تـەواوی بابەتەکانـی پرۆگرامی خوێندنـی تەواوکردبێت و لە تەواوی تاقیکردنەوەکانیش دەرچووبێت.

**ماددەی (18):**

وەزارەت، بـە هەماهەنگی لەگـەڵ وەزارەتـە پەیوەندیدارەکانی دیکە و کەرتـی تایبـەت، کاردەکات بـۆ بەسـتنەوەی خوێندنـی ئامادەیی پیشەیی بە بازاڕی کار لەلایەک و خوێندنی باڵا لەلایەکی دیکە.

## بەشی چوارەم
## پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییەکان

---

## تەوەری یەکەم
## بنەماکانی خوێندن لە پەیمانگە پەروەردییە پیشەییەکان

**ماددەی (19):**

**یەکەم:** دوای تەواوکردنی قۆناغی خوێندنی بنەڕەتی بەدەرچوون لە هەموو بابەتەکانی خوێندن، خوێندکار مافی هەیە بێ بەرامبەر لە پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی حکومی دەست بە خوێندن بکات، ئەگەر مەرجەکانی پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی پەیوەندیداری تێدا بێت و تەمەنیشی لە (20) بیست ساڵ زیاتر نەبێت.

**دووەم:** خوێندکار بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە مافی بەردەوامبوونی خوێندنی لە پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییە حکومییەکان هەیە، بە مەرجێک تەمەنی لە (28) بیست و هەشت ساڵ تێپەڕ نەکات.

**سێیەم:** وەرگرتنی خوێندکار لە پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییە جیاوازەکان، بەپێی ڕێنمایی دەبێت کە ئەنجومەنی وەزارەت پێش کۆتایی مانگی ئازاری هەر ساڵێک بڕیاری لێ دەدات و وەزیر دەریدەکات.

## تەوەری دووەم
## ئامانج لە پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییەکان

**ماددەی (20):**

**یەکـەم:** ئامادەکردنـی خوێندکار بۆ پیشـەیەکی دیاریکـراو لە بازاڕی کاردا.

**دووەم:** بەهێزکردنی تواناکانی خوێندکار سـەبارەت بە گەشەکردنی بیرکردنـەوەی زانسـتی، قوڵبوونـەوەی توانسـتی توێژینـەوە و تاقیکردنـەوە، پیادەکردنـی پرۆگرامـی خوێنـدن، بەکارهێنانـی سـەرچاوەکان و ڕاهاتـن لەسـەر شـێوازە هاوچەرخەکانـی خوێندن و تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو.

**سـێیەم:** بنیاتنانـی بناغەیەکی بەهێز بۆ گەشـەپێدانی کەسـایەتی خوێنـدکار و بەشـداریکردنی لـە ژیانـی کۆمەڵایەتـی و هاندانـی بـۆ پێکەوەژیانـی ئاشـتییانە، گەشـەپێدانی توانسـتە زانسـتییەکانی، بایەخپێدانـی تـا بتوانێـت سـەربەخۆیانە کار بـکات و توانـای هەماهەنگی لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەبێت.

## تەوەری سێیەم
## پڕۆژەی پەیمانگەی پەروەردەیی و پیشەیی

**ماددەی (21):**

خوێنـدکاری پۆلـی چوارەمـی پەیمانگـە پەروەردەییە پیشـەییەکان، دەبێت یەکێک لەم دوو بژاردەیە هەڵبژێرێت:-

**یەکەم:** پرۆژەیەکی زانستی یان پیشەیی بە ناوی پرۆژەی پەیمانگەی پەروەردەیی پیشـەیی ئەنجام بدات، ئـەو خوێندکارەی لە پرۆژەکەیدا

نمرەی پێویستی بەدەست نەهێنا بە دەرنەچوو هەژمار دەکرێت.

**دووەم:** بەشـداری لـە خولێکـی ڕاهێنـان کـە لـە (١٤) چـواردە ڕۆژی پشـووی هاویـن کەمـتر نەبێت بـکات، ئـەو خوێنـدکارەی پابەندی بەشداربوونی تەواو نەبێت، بە دەرنەچوو هەژمار دەکرێت.

**ماددەی (22):**

پێویسـتە وەزارەت بـە هاریکاریی وەزارەتـە پەیوەندیدارەکانی دیکە و کەرتی تایبەت، کار بکات بۆ ئەوەی خوێندن لە پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییەکان لەگەڵ بازاڕی کار لەلایەک و خوێندنی باڵاش لەلایەکی دیکەوە بگونجێنێت.

# بەشی پێنجەم
# حوکمە هاوبەشەکان

---

## تەوەری یەکەم
## بنەما هاوبەشەکان

**ماددەی (23):**

**یەکەم:** پێویستە دامەزراوە پەروەردەییە حکومی و ناحکومییەکان وفەرمانبەرانیان، کار لە پێناو جێبەجێکردنی بنەما و ستانداردەکانی دڵنیایی جۆری و بەدەستهێنانی متمانەی دامەزراوەیی و متمانەی پرۆگرامەکاندا، بکەن.

**دووەم:** پێویستە هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی حکومی ناوێکی جیاکەرەوەی هەبێت و نابێت دامەزراوە هەمان ناو، یان هەمان ناوی لێکدراوی دامەزراوەیەکی دیکەی لە هەمان بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پەروەردە هەبێت.

**ماددەی (24):**

**یەکەم:** پێویستە دامەزراوەکان پلانی ساڵانەیان بۆ گەشەپێدانی بەڕێوەچوونی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن هەبێت.

**دووەم:** پێویستە سەرجەم مامۆستایان پلانی ساڵانە و وەرزانە بۆ ئەو بابەتانەی لە ئەستۆیانە دابڕێژن، خشتە و چالاکییە پلان بۆ دانراوەکان لەخۆبگرن و لە هەفتەی یەکەمی هەموو وەرزێکی خوێندندا بەسەر قوتابیان و خوێندکاراندا دابەش بکرێن.

**سێیەم:** دامەزراوەی پەروەردەیی حکومی، پاش وەرگرتنی مۆڵەتی وەزارەت، دەتوانێت لە پۆلدا سوود لە دوو مامۆستا وەربگرێت، کە یەکێکیان دەبێت بە مامۆستای سەرەکی و ئەوەی دیکەش دەبێتە مامۆستای هاوکار.

**ماددەی (25):**

**یەکـەم:** ئەرکـی دامەزراوەکانـە تێڕوانینیـان لەسـەر بنەمـای ئـەوە بێـت، کە هەر قوتابـی و خوێندکارێک ڕێچکەیەکـی تایبەت بە خۆی هەیـە بـۆ فێربوون و داهێنان و پێویسـتە پرۆسـەی خوێندن توانا و تایبەتمەندی هەر قوتابی و خوێندکارێک وەک تاک بە جیا لە بەرچاو بگرێت.

**دووەم:** ئەرکـی دامەزراوەکانـە پشـتیوانی قوتابـی و خوێنـدکار لـە ئەسـتۆ بگرن و کاری بۆ بکەن، بە تایبەتیش پشـتیوانی ئەو قوتابی و خوێندکارانەی پێویستیان بە هاوکاریی زانستی زیاتر هەیە، دەبێت ئەو پاڵپشتیە لە ساڵانی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتیدا چڕتر بێت.

## تەوەری دووەم
## پرۆگرامەکانی خوێندن و هۆیەکانی فێرکردن

**ماددەی (26):**

وەزارەت تایبەتمەنـدە بەدانانـی پرۆگرامـەکان و کتێبەکانـی خوێندن، گەشـەپێدانی شـێوازەکانی وانەوتنەوە و کەرەسـتەکان و هۆیەکانی فێربـوون، بەجۆرێک کە کتێبـە بنەڕەتییەکانی فێربوونی زمـان و زانسـتەکان و بیـرکاری و مێـژوو و جوگرافیـا و پـەروەردەی ئیسـلامی و (پەروەردەی مەسـیحی و پەروەردەی ئێزدیایەتی بە پێی تایبەتمەنـدی) و هونـەر و وەرزش، و ئـەو بابەتانـەی کـە وەزارەت دوای هەڵسەنگاندنی زانستی بە پێویستی دەزانێت بۆ گەشپێدانی کارامەیی زانسـتی و بەهایی قوتابیان و خوێنـدکاران و پێکەوەژیانی گەلی کوردستان، بخوێندرێن.

## تەوەری سێیەم
## وەرز و کاتەکانی خوێندن لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

**ماددەی (27):**

**یەکەم:** هەر ساڵێکی خوێندن لە وەرزی یەکەم و دووەمی خوێندندن پێکدێت، وەرزی یەکەم لە مانگی ئەیلوول و وەرزی دووەمیش لە مانگی کانوونی دووەم دەستپێدەکات. لە دۆخی نائاساییدا ئەنجومەنی وەزارەت دەتوانێت بۆ ساڵێکی خوێندن گۆڕانکاری لەو کاتانەدا بکات.

**دووەم:** هەر ساڵێکی خوێندن لانیکەم (170) سەد و حەفتا ڕۆژی خوێندن لەخۆ دەگرێت، هەر حەفتەیەک لانیکەم (5) پێنج ڕۆژی خوێندن لەخۆ دەگرێت وهەر ڕۆژێکی خوێندن لە (4) چوار کاتژمێر کەمتر نابێت.

**سێیەم:** ئەمانەی خوارەوە پشووەکانی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکانن:

1 - پشووی سەری ساڵی زایینی لە ڕۆژی (30) سی کانونی یەکەم تا ڕۆژی (2) دووی کانونی دووەم.

2 - پشووی نیوەی ساڵ، کە دوای کۆتاییهاتنی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی وەرزی یەکەم لە مانگی کانوونی دووەم دەبێت و نابێت پشووەکە لە یەک هەفتە زیاتر بێت .

3 - پشووی سەری ساڵی کوردی کە لەڕۆژی (19) نۆزدەی ئازار تا ڕۆژی (24) بیست وچواری ئازار دەبێت.

4 - پشووی هاوین، کە ماوەکەی لە دوو مانگ کەمتر نابێت و بە ڕەچاوکردنی کاتی تاقیکردنەوەکان و دۆخی ناهەموار، دەکرێت بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی وەزارەت گۆڕانکاریی تێدا بکرێت.

5 - پشووی جەژنەکان.

**چـوارەم :**وەزارەت دەتوانێـت لەکاتی پێویسـتدا گۆڕانکاریی لەکاتی پشـووەکاندا بکات، بەمەرجێک لەگەڵ ئەو پشووانە ناکۆک نەبێت کە لە یاسا بەرکارەکان و بڕیارەکانی پەرلەمانی کوردستاندا هاتوون.

## تەوەری چوارەم
## ڕاگرتنی خوێندن لە بارودۆخی نائاساییدا

**ماددەی (28):**

**یەکـەم:** لـە بارودۆخـی نائاسـاییدا وەزیـر دەتوانێـت دەوامـی دامـەزراوەکان بـۆ مـاوەی (7) حـەوت ڕۆژ ڕابگرێـت، بـە مەرجێـک ئەنجومەنـی وەزیران لە بڕیارەکە و هۆ و ڕێکارەکانی ڕاگرتنەکە ئاگادار بکرێتـەوە، ئەنجومەنی وەزیـران مافی درێژکردنـەوەی ماوەکەی بە درێژایی بارودۆخە نائاساییەکە هەیە.

**دووەم:** لـە بارودۆخـی نائاسـاییدا بەڕێوبەری گشـتیی پـەروەردە لە پارێـزگا وئیـدارە سـەربەخۆکان دەتوانێـت دەوامی دامـەزراوەکان بۆ مـاوەی (2) دوو ڕۆژ ڕابگرێـت، بەمەرجێـک وەزیر لـە بڕیارەکە وهۆ و ڕێکارەکانـی ڕاگرتنەکە ئاگادار بکرێتەوە، و وەزیر مافی درێژکردنەوەی ماوەکەی بۆ (7) حەوت ڕۆژ هەیە.

## تەوەری پێنجەم
## بەشەوانەکانی خوێندن

**ماددەی (29):**

پێـش کۆتاییهاتنی مانگی ئایاری هەموو سـاڵێک، دەبێت وەزارەت لانیکەمـی ژمـارەی وانەکانـی خوێنـدن لـە هـەر بابەتێکـدا و بۆ هەر قۆناغێکـی خوێنـدن بـۆ سـاڵی خوێندنـی داهاتـوو دیـاری بـکات، بـە مەرجێـک لەگـەڵ بازنەکانـی خوێنـدن و چوارچێـوەی پرۆگرامـی فێرکردندا بگونجێت.

## تەوەری شەشەم
## پێدانی کتێب و پێداویستییەکانی خوێندن

**ماددەی (30):**

**یەکەم:**

1 - ئەرکـی وەزارەتـە، لـە سـەرەتای سـاڵی خوێندنـدا، کتێبەکانـی خوێنـدن بەخۆڕایـی، بۆ دامـەزراوە پەروەردەییە حکومییـەکان دابین بکات، بەمەبەستی دابەشکردنیان بەسەر قوتابیان و خوێندکاراندا.

2 - پێویسـتە وەزارەت لـە سـەرەتای سـاڵی خوێندنـدا کتێبەکانـی خوێندن، بە تێچووی خۆی بەبێ قازانج بۆ ئەو دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییانـەی پرۆگرامـی حکومـی بـە کاردێنـن دابیـن بـکات، بەمەبەسـتی دابەشـکردنیان بەسـەر قوتابیـان و خوێندکارانـدا بـە خۆڕایی.

**دووەم:** ئەرکـی وەزارەتـە، پێـش دەسـتپێکردنی سـاڵی خوێنـدن پێداویستییەکانی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان، دابین بکات.

# تەوەری حەوتەم
# مافی خوێندن بە زمانەکانی دیکە لە قوتابخانە و خوێندنگە حکومییەکاندا

**ماددەی (31):**

**یەکەم:** خوێندن بە زمانی عەرەبی، تورکمانی، سریانی و ئەرمەنی، بۆ قوتابی و خوێندکارانی ئەو پێکهاتانە، لە دامەزراوەی پەروەردەیی حکومی تایبەت بەو زمانانە دابیندەکرێت، بە مەرجێک زمانی دایکی بەخێوکاری قوتابی و خوێندکار زمانی کوردی نەبێت و ژمارەی قوتابیان و خویندکاران بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەکی لەو جۆرە گونجاوبێت، هاوکات زمانی کوردیش لەو ناوەندانە بخوێندرێت.

**دووەم:** ئەگەر قوتابیەکی بنەڕەتی لە قوتابخانەیەکی حکومی بخوێنێت، کە خوێندن تێیدا بە زمانی دایک نەبێت، مافی هەیە بێ بەرامبەر لەسەر داوای بەخێوکار بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لە هەفتەیەکدا بە زمانی دایک بخوێنێت، بە مەرجێک زمانی دایکی بەخێوکارەکەی زمانی کوردی نەبێت و ژمارەی ئەو قوتابیانەی کە دەیانەوێت بەو زمانە بخوێنن لە (10) دە قوتابی کەمتر نەبێت.

**سێیەم:** وەزارەت دەتوانێت بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە، باخچەی منداڵان و قوتابخانە و خوێندنگە و پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی حکومی بە زمانە جیهانییەکان بکاتەوە، لەگەڵ پابەندکردنیان بە خوێندنی زمانی کوردی تیایاندا.

# تەوەری هەشتەم
# قوتابیان و خوێندکارانی خاوەن پێداویستی تایبەت

**ماددەی (32):**

**یەکـەم:** قوتابـی و خوێنـدکاری خـاوەن پێداویسـتی تایبـەت، کـە لـە چوارچێـوەی تەمەنـی یاسـایی خوێندندایـە، مافـی خوێنـدن و دابینکردنی هەلی یەکسـان، وەرگرتـن و بەردەوامبوونی خوێندنیان لـە دامەزراوەکاندا هەیە، بە ڕەچاوکردنـی بڕگەی (چوارەم)ی ماددەی (35)ی ئەم یاسایە.

**دووەم:** پێویستە لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن گرنگی بە قوتابیان و خوێندکارانی خاوەن پێداویسـتی تایبەت بدرێـت، بەپێی جیاوازیی توانسـت و ئامادەباشـیان، لەگـەڵ دابینکردنـی مامۆسـتایانی پەروەردەی تایبەت.

**سـێیەم:** دەبێـت وەزارەت پێـوەر و هـۆکار و کەلوپەلـی تایبـەت و شـێوازی هەڵسـەنگاندن و تاقیکردنـەوەی گونجـاو بـۆ قوتابـی و خوێندکارانی خاوەن پێداویستی تایبەت، دابین بکات.

**چـوارەم:** ئەرکی وەزارەتـە ناوەڕۆکی پلانی فێرکـردن و پرۆگرامەکانی خوێنـدن و بەڵگـە پەروەردەییـەکان، بـۆ میلاکەکانـی فێرکـردن و چالاکییە تایبەتەکان، کە پەیوەسـتن بە کتێبەکانی خوێندن، گەشـە پێبدات و بیانوەخسێنێت.

**پێنجـەم:** ئەرکـی وەزارەتە کاربکات بـۆ پتەوکردنی ڕۆڵی هۆشـیاریی کۆمەڵگە و بەشـداریپێکردنی کەسـوکاری قوتابیان و خوێندکاران و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی.

**شەشـەم:** پێویسـتە دامـەزراوەکان کاربکـەن بـۆ ئـەوەی تـەلاری قوتابخانـە و خوێندنگـە و پەیمانگـە پەروەردەییـە پیشـەییەکانیان

لەگـەڵ پێداویسـتییەکانی کەسـانی خـاوەن پێداویسـتیی تایبـەت بگونجێنن و ژینگەیەکی پەروەردەیی و فێرکاریی گونجاویان بۆ دابین بکەن.

**حەوتـەم:** ئەرکی وەزارەتە ڕێـڕەوی خوێندنی جۆراوجۆر، پێداویسـتی خوێندنـی پیشـەیی و تەکنیکـی، بوارەکانی دیکـەی گونجاو لەگەڵ تواناکانیان، بۆ قوتابیان و خوێندکارانی خاوەن پێداویسـتی تایبەت، دابین بکات.

## تەوەری نۆیەم
## خوێندنی ئەلکترۆنی

**ماددەی (33):**

وەزارەت لە کاتی پێویسـت، لەهەر قۆناغێکی خوێندندا بێت، مافی ڕێگەپێدانـی بە خوێندنـی ئەلیکترۆنی و ئۆنلایـن وئاوێتە بە هەموو جۆرەکانیانەوە، هەیە.

## تەوەری دەیەم
## قوتابخانە و خوێندنگەی تایبەتمەند و بەهرەداران

**ماددەی (34):**

**یەکـەم:** وەزارەت مافـی کردنـەوەی قوتابخانـە و خوێندنگـەی تایبەتمەند و بەهرەدارانی هەیە.

**دووەم:** مەرجەکانی تەمەن، وەرگرتن لە قوتابخانە و خوێندنگەکانی بەهـرەداران، چۆنیەتـی خوێنـدن، تاقیکردنـەوەکان، کاروبـاری

کارگێڕیی و چۆنیەتی سەرپەشتیکردن، بە پەیڕەوێک ڕێکدەخرێت، کە ئەنجومەنی وەزیران لەسەر پێشنیاری وەزارەتی پەروەردە دەریدەکات.

**سێیەم:** دەکرێت مەرجەکانی تەمەن لە قوتابخانە و خوێندنگەکانی بەهرەداران، بەدەربن لەو مەرجانەی لە ماددەی (9) و (13)ی ئەم یاسایەدا دەقنووسکراون.

## تەوەری یازدەیەم
## وەرگرتنی منداڵان و قوتابیان و خوێندکاران

**ماددەی (35):**

**یەکەم:** وەرگرتنی منداڵان و قوتابیان و خوێندکاران و تۆمارکردنیان لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان، لەسەر بنەمای ڕەخساندنی هەلی یەکسان بۆ هەمووان دەبێت.

**دووەم:** پێویستە هەموو قوتابخانە و خوێندنگەیەکی حکومی، جگە لە قوتابخانە و خوێندنگەکانی تایبەتمەند و بەهرەداران، بە پلەی یەکەم ئەو قوتابی و خوێندکارانە وەربگرن کە دانیشتووی ئەو گەڕەک و ناوچە جوگرافیەن، کە قوتابخانە و خوێندنگەکەی تێدایە.

**سێیەم:** نابێت دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان، جگە لە قوتابخانە و خوێندنگەکانی تایبەتمەند و بەهرەداران، مەرجی پێشوەختە و تاقیکردنەوەی دەرەکی بۆ وەرگرتنی قوتابی و خوێندکار دابنێن، جگە لە مەرجەکانی توانای زمانەوانی و ئەو مەرجانەی لەم یاسایەدا ڕێگەیان پێدراوە.

**چوارەم:**

1 - وەرگرتنی منداڵان و قوتابیان و خوێندکارانی خاوەن پێداویستی تایبەت بەپێی یەکێک لەم دوو میکانیزمە دەبێت:-

أ- ئـەو منداڵ و قوتابی و خوێندکارانـەی، لەلایەن لیژنەی تایبەتەوە هەڵسـەنگاندنیان بـۆ کـراوە و توانـای فێربوونـی پرۆگرامەکانیـان لا ئاسـانترە، لـە پۆلـی ئاسـایی وەک قوتابیانی دیکـە وەردەگیرێن، بـەڵام مامۆسـتای تایبەتیان وەک مامۆسـتای دووەم لـە پۆلدا بۆ تەرخاندەکرێت.

ب- ئـەو منداڵ و قوتابی و خوێندکارانەی لەلایەن لیژنەی تایبەتەوە هەڵسـەنگاندنیان بـۆ کـراوە و توانـای فێربوونـی پرۆگرامەکانیـان، بەهۆی ئۆتیزم، داون سـیندرۆم، یان ئیفلیجی قورسـی مێشـک و هتـد، لا قورسـترە، لـە پۆلێکـی تایبـەت لـە دامـەزراوە پەروەردەییە حکومییەکـە، یان لـە دامەزراوەیەکـی پەروەردەیـی حکومی تایبەت وەردەگیرێن و پرۆگرام و مامۆستای تایبەتیان بۆ دابین دەکرێت.

2 - وەزیـر دەتوانێـت منـداڵان و قوتابیـان و خوێنـدکارانی خـاوەن پێداویستی تایبەت لە مەرجی بەرزترین تەمەنی هاتوو لە ماددەکانی (9) و (13)ی ئەم یاسایە بەدەربکات.

پێنجەم: قوتابیان و خویندکاران مافی گواستنەوەیان لە ناوەندێکی خوێنـدن بۆ ناوەندێکی دیکەی خوێندن هەیە، بەپێی ئەو مەرجانەی وەزارەت دیاری دەکات.

# تەوەری دوازدەیەم
# قوتابی و خوێندکاری گەڕاوە لە دەرەوەی هەرێم

**ماددەی (36):**

**یەکەم:** پێویستە وەزارەت ڕێکاری پێویست بۆ ئاسان وەرگرتنی ئەو قوتابی و خوێندکارانەی لە دەرەوەی هەرێم دەگەڕێنەوە، بگرێتەبەر.

**دووەم:** ئەو قوتابی و خوێندکارانەی لە دەرەوەی هەرێم دەگەڕێنەوە و پێشتر لە ساڵێک زیاتر لە دەرەوەی هەرێم نیشتەجێ بوون، مافی خوێندنیان هەیە بەم مەرجانەی خوارەوە:-

1 - نوسراوێکی ڕاستێندراو لەو قوتابخانە، یان خوێندنگە، یان پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییەوە بێنن، کە لە دەرەوەی هەرێم لێیهاتوون.

2 - بڕوانامەکانی خوێندنیان پێشکەش بکەن بەمەبەستی هاوتاکردنیان لەلایەن وەزارەتەوە، وەک بنەمایەک بۆ وەرگرتنیان لەو ئاستەی بەپێی هەڵسەنگاندنی وەزارەت بە گونجاو دەزانرێت.

**سێیەم:**

1 - ئەو قوتابی و خوێندکارانەی لە دەرەوەی هەرێم گەڕاونەتەوە و زمانی کوردی یان عەرەبی، یاخود هەردووکیان باش نازانن، بۆ ماوەی (2) دوو ساڵ لە دەرچوون لەو بابەتانە دەبەخشرێن، بە مەرجێک لەناو پۆلی خوێندنی زمانەکان بەشداربن، پۆلی دوازدەش لە نێو ئەو (2) دوو ساڵەدا نەبێت، کە لە دەرچوون دەبەخشرێن.

2 - ئەو قوتابی و خوێندکارانەی بەخێوکارانیان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە هەرێمی کوردستان، لە چوارچێوەی نێردە دیپلۆماسی و ئاژانسە نێودەوڵەتییەکان دەمێننەوە، لە حوکمی خاڵی (1)ی ئەم بڕگەیە بەدەردەکرێن و وەزیر بە ڕێنمایی شێوازی خوێندن و دەرچوونیان لە زمانەکانی کوردی و عەرەبی ڕێکدەخات.

## تەوەری سیازدەیەم
## کار و ڕەفتارە ڕێپێنەدراوەکان

**ماددەی (37):**

**یەکەم:** ئەو کار و ڕەفتارانەی لەگەڵ پەیامی پەروەردە و فێرکردن ناگونجێن، لە دامەزراوەکاندا ڕێپێنەدراون، بەتایبەتیش ئەمانەی خوارەوە:-

1 - هەڵگرتنی چەک و ئامێری بریندارکەر و مەترسیدار.
2 - جگەرەکێشان و نێرگەلەکێشان بەهەموو جۆرەکانیەوە.
3 - چالاکی دوور لە پەروەردە و فێرکردن و ڕێکلامی بازرگانی و چالاکی سیاسی.
4 - بەکارهێنانی توندوتیژی جەستەیی و دەروونی و مەعنەوی و ڕەفتاری یەکتر شکاندن.
5 - بەکارهێنان و خستنەڕووی ئەو دروشمانەی لەگەڵ بنەماکانی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی گەلی کوردستان ناگونجێن.

**دووەم:** ئەو کەسەی سەرپێچی خاڵەکانی بڕگەی (یەکەم)ی ئەم ماددەیە دەکات، بەپێی ڕێنمایی وەزارەت سزای کارگێڕی دەدرێت، بێ ئەوەی ڕێگە لە هەر سزایەکی دیکە بگرێت ، کە لە یاسایەکی دیکەی بەرکاردا دەقنووسکراوە.

**سێیەم:** بنەماکانی پەیڕەوی خوێندن و ڕێکخستنی هەڵسوکەوتی قوتابیان و خوێندکاران بەپێی ڕێنمایی وەزارەت ڕێکدەخرێن، بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە سزای دوورخستنەوەی قوتابیانی قۆناغی بنەڕەتی لەماوەی یەک ساڵی خوێندندا نابێت لە (10) دە ڕۆژ زیاتر بێت.

**ماددەی (38):**

سیستمی یەکپۆشی بۆ قوتابیان و خوێندکاران لە دامەزراوە پەروەردەییەکاندا پەیڕەو دەکرێت، وەزارەت بە ڕێنمایی شێوازەکەی دیاریدەکات، هەر گۆڕانکارییەکیش بکات، دەبێت پێش کۆتاییهاتنی مانگی ئایار گشت دامەزاروە پەروەردەییەکانی لێ ئاگادار بکاتەوە.

**ماددەی (39):**

پێویستە قوتابی و خوێندکار لە وانەکان ئامادە و بەشداربن، لانی زۆری ڕۆژانی ئامادەنەبوونی قوتابی و خوێندکار، بە ڕێنماییەک ڕێکدەخرێت، کە لەلایەن وەزیرەوە دەردەکرێت.

## تەوەری چواردەیەم
## ژمارەی بازنە، قۆناغ و پۆل، و تەلار و کتێبخانە لە دامەزراوەکاندا

**ماددەی (40):**

**یەکەم:** پێویستە هەموو قوتابخانەیەکی خوێندنی بنەڕەتی لە یەک بازنەی خوێندن کەمتر لە خۆ نەگرێت، جگە لە گوند و ناوچە دوورەدەستەکان.

**دووەم:** پێویستە هەموو خوێندنگەیەکی ئامادەیی هەر سێ پۆلەکانی دەیەم، یازدەیەم و دوازدەیەم لەخۆ بگرێت، لە کاتی کردنەوەی خوێندنگەیەکی نوێ دەکرێت بە یەک پۆل دەستپێبکرێت.

**سێیەم:** پێویستە هەموو پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی هەر (5) پێنج قۆناغەکانی خوێندن لەخۆ بگرێت، لەکاتی کردنەوەی پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی نوێ دەکرێت بە قۆناغی یەکەم دەستپێبکرێت.

**ماددەی (41):**

**یەکەم:** دەکرێت باخچەی منداڵان پاشکۆی قوتابخانە و خوێندنگە بێت و بەشێکی تەلاری قوتابخانە، یان خوێندنگەکە بەکاربهێنێت، بەمەرجێک پەرژینێک، یاخود بەربەستێک لە نێوانیاندا هەبێت.

**دووەم:** دەکرێت تەلاری دامەزراوەیەکی پەروەردەیی و فێرکردن لە پۆلی یەکەمی خوێندنی بنەڕەتی تا پۆلی دوازدەیەمی ئامادەیی لەخۆ بگرێت، بە مەرجێک بەربەستێک یاخود ڕێگرێک لە نێوان قوتابیان و خوێندکاراندا هەبێت.

**سێیەم:** لە تەلاری کۆمەڵگەی پەروەردەییدا، دەبێت بەربەستێک، یاخود ڕێگرێک لەنێوان منداڵان و قوتابیان و خوێندکاراندا هەبێت.

**ماددەی (42):**

دەبێت دامەزراوەکان کتێبخانەیان هەبێت، پەڕاویی یان ئەلیکترۆنی یان هەردووکیان، لە ئەگەری نەبوونیدا کارئاسانی بۆ گەیشتنی قوتابیان و خوێندکاران بە نزیکترین کتێبخانە، یان دەستگەیشتنیان بە کتێبخانەی ئەلیکترۆنی دەکرێت و وەزیر بە ڕێنمایی ئەم بابەتە ڕێکدەخات.

## تەوەری پازدەیەم
## ئەنجومەنی بەخێوکارانی قوتابیان و دیداری گەشە

**ماددەی (43):**

**یەکەم:** بە مەبەستی پشتگیریکردنی منداڵەکانیان و پەرەپێدانی دامەزراوەکە، بەخێوکاران دەتوانن ئەنجومەنی بەخێوکارانی دامەزراوە پێکبهێنن، کە لە (3-9) بەخێوکار پێکدێت و بۆ هەر ساڵێکی خوێندن یەکێکیان سەرۆکایەتی دەکات.

**دووەم:** ئەنجومەنی بەخێوکاران بە هەماهەنگی دامەزراوە

دەتوانێت ئامانج و پلانی کاری خۆی دابڕێژێت و بۆ تاوتوێکردنی دۆخی خوێندنی قوتابی و خوێندکار و بە مەبەستی دروستکردنی لێکتێگەیشتنی هاوبەش کۆبوونەوەی خۆی لە کاتی پێویستدا دەکات، ئەرکی بەڕێوەبەری دامەزراوەیە لە هەموو ڕوویەکەوە کارئاسانیان بۆ بکات.

**ماددەی (44):**

دەبێت قوتابخانە و خوێندنگەکان لە ناوەڕاستی هەر وەرزێکی خوێندندا، بە بەشداری مامۆستا، بەخێوکار، قوتابی و خوێندکار، دیداری گەشە بۆ تاوتوێکردنی دۆخی خوێندنی قوتابی و خوێندکارانیان، بە ئاڕاستەی لێکتێگەیشتنی هاوبەش بۆ پەرەپێدانی تواناکانیان و باشترکردنی ئاستی خوێندنیان ڕێکبخەن.

## تەوەری شازدەیەم
## تۆمارەکانی دامەزراوە حکومییەکان

**ماددەی (45):**

**یەکەم:** ئەرکی گشت دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکانە، ژمارەیەک تۆماریان بەپێی ڕێنماییەکانی وەزارەت، هەبێت.

دووەم: دەبێت دامەزراوەکان دۆسیەیان سەبارەت بە هەر قوتابی و خوێندکارێک هەبێت، دۆسیەکە هەر لە سەرەتای خوێندنەوە زانیاریی سەبارەت بە قوتابی و خوێندکار و چۆنیەتی هاوکاریکردنی و چۆنیەتی بەڕێوەچوونی خوێندنی ئەو قوتابی و خوێندکارەی تێیدا تۆمار دەکرێت، بۆ ئەو مەبەستە وەزارەت دەتوانێت سیستمی ئەلیکترۆنی بەگەڕبخات.

## تەوەری حەڤدەیەم
## چێشتخانە و فرۆشگە لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

**ماددەی (46):**

**یەکەم:**
1 - هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی حکومی، مافی کردنەوەی چێشتخانە و فرۆشگەی بۆ قوتابی و خوێندکارانی دامەزراوەکە هەیە، بە مەرجێک پەسەندنامەی وەزارەتی تەندروستی بۆ وەربگیرێت.
2 - لە کاتی کردنەوەی چێشتخانە و فرۆشگە دەبێت خواردەمەنییەکان تەندروست و بە نرخێکی گونجاو بن، کە پێشوەختە و ساڵانە لەلایەن دامەزراوەکە، یاخود لیژنەیەکی وەزارەت پەسەند دەکرێت.

**دووەم:** ئەرکی ئەنجومەنی دامەزراوەکەیە زیادکردنی ئاشکرا بۆ بەکرێدانی چێشتخانە و فرۆشگەکە سازبکات، و وردەکاری ئەم پرسە بە ڕێنمایی ڕێکدەخرێت کە وەزیر دەریدەکات.
**سێیەم:** داهاتی بەکرێدانی چێشتخانە و فرۆشگە، بەپێی ڕێنمایی وەزارەت، بۆ مەبەستی بەرەوپێشبردنی خودی دامەزراوەکە خەرج دەکرێت.

**چوارەم:** ئەرکی دامەزراوەکەیە چاودێری پابەندبوونی بەڵێندەر بە مەرجەکان و ڕێنماییە تەندروستییەکانی وەزارەتی تەندروستی بکات.

# بەشی شەشەم
# دامەزراوە هاوبەش و پشتیوانکراو و نێودەوڵەتییەکان

---

## تەوەری یەکەم
## دامەزراوە هاوبەش و پشتیوانکراوەکان

**ماددەی (47):**

**یەکەم:** وەزارەت دەتوانێت بەڕێوەبردنی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی حکومی ڕادەستی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی بکات بەرامبەر بە تێچووی ساڵانە.

**دووەم:**

1 - دەبێت وەزارەت، بە پێی گرێبەستێک بڕە پارەیەک بۆ ئەو دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومیانەی لە بڕگەی (یەکەم)ی ئەم ماددەیەدا ئاماژەی پێکراوە، دابین بکات.

2 - دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکە گشت تێچووەکانی مووچە و کرێی تەلارەکە و تێچووەکانی دیکە لە ئەستۆ دەگرێت.

**سێیەم:** ڕادەستکردن، پێدانی تێچووی ساڵانە بە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکە، شێوازی بەڕێوەبردن، هەلومەرجی کاری فەرمانبەران، شێوازی سەرپەشتیکردن، تاقیکردنەوەکان، بڕوانامەکان و گشت پرسەکانی دیکە، بەپێی گرێبەستی پێشوەختەی نێوان وەزارەت و دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکە دەبێت، کە هەر (3) سێ ساڵ جارێک نوێ دەکرێتەوە.

**چوارەم:** ئەو دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییانەی بەڕێوەبردنی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان دەگرنە ئەستۆ، دەتوانن پرۆگرامێکی خوێندنی حکومی یاخود پرۆگرامێکی خوێندنی

نێودەوڵەتی باوەڕپێکراو پیادە بکەن.

**پێنجەم:** خوێندن بۆ قوتابیان و خوێندکاران لەم دامەزراوانە بە خۆڕاییە.

**شەشەم:** بەڵگەنامەی دەرچوونی پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی و دوازدەیەمی ئامادەیی ئەم دامەزراوانە، بەیەکێک لەم دوو جۆرە دەبێت:-

1 - ئەگەر پرۆگرامی خوێندنی قوتابخانەکە یان خوێندنگەکە نێودەوڵەتی بوو، بەڵگەنامەی دەرچوون لەسەر بنەمای تێکڕای دەرچوون لە قوتابخانە یان خوێندنگە و دەرچوون لە تاقیکردنەوە نێودەوڵەتییەکان دەدرێت.

2 - ئەگەر پرۆگرامی خوێندن حکومی بوو، بەڵگەنامەی دەرچوون بەپێی ڕێکاری پێدانی بڕوانامە لە قوتابخانە و خوێندنگە حکومییەکان بە هەژمارکردنی دەرئەنجامی تاقیکردنەوەکان دەدرێت.

**حەوتەم:** کاروباری دامەزراوە هاوبەش و پشتیوانکراوەکان، بەپێی ڕێنمایی ڕێکدەخرێت کە وەزیر دەریدەکات.

## تەوەری دووەم
## دامەزراوە پەروەردەییە نێودەوڵەتییە حکومییەکان

**ماددەی (48):**

**یەکەم:** وەزارەت دەتوانێت لە ڕێگەی گرێبەست لەگەڵ ناوەندێکی فێرکردنی نێودەوڵەتی، دامەزراوەیەکی پەروەردەیی و فێرکردنی حکومی بکات بە دامەزراوەیەکی پەروەردەیی نێودەوڵەتی حکومی کە وەزارەت بەڕێوەیببات، هەروەها دەتوانێت دامەزراوەی پەروەردەیی نێودەوڵەتی حکومی نوێ بکاتەوە.

**دووەم:**
1 - کارمەندانی ئەم دامەزراوانە فەرمانبەر و کارمەندی حکومی دەبن، بە ڕەچاوکردنی خاڵی (2)ی ئەم بڕگەیە.
2 - وەزارەت دەتوانێت گرێبەست لەگەڵ مامۆستایانی دەرەوەی وڵات بۆ کارکردن لەم دامەزراوانە بکات، بەرامبەر بە بڕە مووچەیەک، دەشتوانێت کارمەندان و مامۆستایانی دەرەوەی وەزارەت بەکاربخات و مووچەی گشت ئەوانە لە داهاتی قوتابخانەکە دەدرێت.
**سێیەم:** خوێندن بۆ قوتابیان و خوێندکاران لەم دامەرزاوانەدا بە خۆڕاییە.
**چوارەم:** پرۆگرامی خوێندنی ئەم جۆرە دامەزراوانە، پشتبەست بە یەکێک لە پرۆگرامە نێودەوڵەتییە بڕواپێکراوەکان دەبێت.

**پێنجەم:** بەڵگەنامەی دەرچوونی پۆلی نۆیەم و دوازدەیەمی قوتابخانە و خوێندنگە نێودەوڵەتییە حکومییەکان، لەسەر بنەمای پروگرامە نێودەوڵەتییەکە و دەرچوون لە تاقیکردنەوە نێودەوڵەتییەکان دەدرێت.

**شەشەم:** کاروباری ئەم جۆرە دامەزراوانە بە ڕێنماییەک ڕێکدەخرێت کە وەزیر دەریدەکات.

## بەشی حەوتەم
## قوتابخانە و خوێندنگەی ئێواران، خوێندنی خێرا، نەهێشتنی نەخوێندەواریی

---

## و تاقیکردنەوەی دەرەکی
## تەوەری یەکەم

**قوتابخانە و خوێندنگەی ئێواران**

**ماددەی (49):**

**یەکەم:** بەدەر لە خوێندنی زمانی سریانی و تورکمانی، قوتابخانەی ئێواران دەوامی ئێوارانە و بۆ ئەو قوتابی و خوێندکارانە تەرخانکراوە، کە بەهۆی دەرنەچوونی (2) دوو ساڵ لەسەر یەک لەهەمان پۆل، یاخود بەهۆی تێپەڕبوونی تەمەنی یاساییان، مافی بەردەوامبوونیان لە قوتابخانەی بنەڕەتی و ئامادەیی ڕۆژ نییە.

**دووەم:** ئەو قوتابی و خوێندکارانەی خوێندنی ئێواران بە سەرکەوتوویی ئەنجام دەدەن و لە تەمەنی یاسایی خوێندنی بنەڕەتی یان ئامادەیین، مافیان هەیە بگەڕێنەوە بۆ قوتابخانە و خوێندنگەی ڕۆژ.

**سێیەم:** کاتەکانی خوێندنی قوتابخانە و خوێندنگەی ئێواران، ژمارەی بەشە وانەکان ، تاقیکردنەوەکان، بڕوانامەکان و هەموو کاروبارەکانی پەیوەست بە قوتابخانە و خوێندگەکانی ئێواران، بە ڕێنماییەک ڕێکدەخرێت کە وەزیر دەریدەکات.

## تەوەری دووەم
## خوێندنی خێرا و نەهێشتنی نەخوێندەواریی

**ماددەی (50):**
وەزارەت هەردوو جۆری خوێندنی خێرا و نەهێشتنی نەخوێندەواریی تەرخاندەکات، بۆ ئەو کەسانەی بەپێی مەرجی تەمەنی هاتوو لەم یاسایەدا مافی خوێندنیان لە ناوەندی خوێندنی پەیڕەوکراو نییە.

### لقی یەکەم

**خوێندنی خێرا**

**ماددەی (51):**
**یەکەم:** خوێندنی خێرا بۆ ئەو کەسانەیە کە لە (2) دوو ساڵ زیاتر وازیان لە قوتابخانە هێناوە، یاخود پەیوەندیان بە قوتابخانەوە نەکردووە و تەمەنیشیان لە ڕۆژی (31) سی و یەکی کانونی یەکەمی ئەو ساڵەی خوێندن لە (9) ساڵ زیاترە و لە (16) شازدە ساڵ کەمترە.

**دووەم:** ئەو قوتابیانەی خوێندنی خێرا کە تەمەنیان لە (14) چواردە ساڵ تێپەڕ ناکات، لە تەلاری تایبەت بە خۆیان دەخوێنن.

**ماددەی (52):**
ماوەی خوێندن لە قوتابخانەکانی خوێندنی خێرا (5) پێنج ساڵە و ئەم پێنج ئاستەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:-

ئاستی یەکەم، هاوتایە بە ئاستی پۆلی یەکەم و دووەمی قۆناغی بنەڕەتی.

ئاستی دووەم، هاوتایە بە ئاستی پۆلی سێیەم و چوارەمی قۆناغی بنەڕەتی.

ئاستی سێیەم، هاوتایە بە ئاستی پۆلی پێنجەم و شەشەمی قۆناغی بنەڕەتی.

ئاستی چوارەم، هاوتایە بە ئاستی پۆلی حەوتەم و هەشتەمی قۆناغی بنەڕەتی.
ئاستی پێنجەم، هاوتایە بە ئاستی پۆلی نۆیەمی قۆناغی بنەڕەتی.

**ماددەی (53):**

**یەکەم:** بەڵگەنامەی دەرچوونی قوتابخانەی بنەڕەتی بە ئەو قوتابیە دەدرێت کە بەسەرکەوتوویی ئاستی پێنجەمی خوێندنی خێرای تەواو کردووە.

**دووەم:** ئەو قوتابیەی لە ئاستی پێنجەم دەردەچێت، مافی بەردەوامبوونی خوێندنی لە پۆلی دەیەمی خوێندنگەی ئامادەیی هەیە، بە مەرجێک تەمەنی لە (22) بیست و دوو ساڵ تێپەر نەبوو بێت.

**سێیەم:** بۆ گەڕانەوە بۆ خوێندن لە قوتابخانەی بنەڕەتی پەیڕەوکراو، قوتابیانی خوێندنی خێرا دەبێت لەو تاقیکردنەوانە بەشداربن، کە وەزارەت بە مەبەستی دەستنیشانکردنی ئاستی زانستییان، ڕێکیدەخات.

**چوارەم:** پرۆگرام، بابەتەکانی خوێندن، ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان، بەدەستهێنانی بڕوانامەکان و کاروبارەکانی دیکەی پەیوەست بە خوێندنی خێرا، بە ڕێنماییەک ڕێکدەخرێت کە وەزیر دەریدەکات.

## لقی دووەم

### نەهێشتنی نەخوێندەواریی

**ماددەی (54):**

**یەکەم:** هەموو ئەوانەی کە ناتوانن بخوێننەوە و بنووسن و بنەماکانی ژماردن نازانن و تەمەنیشیان لە سەروی (16) شازدە ساڵە، مافیان هەیە بێ بەرامبەر پەیوەندی بە قوتابخانەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواریی بکەن.

**دووەم:** خوێندن لە قوتابخانەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواریی لە

(3) سێ ساڵی خویندن پێکدێت، هەر کەسێک بەسەرکەوتوویی ئەو قۆناغە ببڕێت، بەڵگەنامەی دەرچوونی نەهێشتنی نەخوێندەواریی پێدەبەخشرێت، کە هاوتایە بە بەڵگەنامەی دەرچوون لە پۆلی (6) شەشی خوێندنی بنەڕەتی.

**سێیەم:** پرۆگرام و بابەتەکانی خوێندن، ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان، بەدەستهێنانی بڕوانامە و کاروبارەکانی دیکەی پەیوەست بە خوێندنی نەهێشتنی نەخوێندەواریی، بە ڕێنماییەک ڕێکدەخرێت کە وەزیر دەریدەکات.

## تەوەری سێیەم
## تاقیکردنەوەی دەرەکی

**ماددەی (55):**

وەزارەت ساڵانە تاقیکردنەوەی دەرەکی، بۆ ئاست و بابەتەکانی خوێندن ڕێکدەخات، بەم شێوەی خوارەوە:-

یەکەم: هەر کەسێک تەمەنی (19) نۆزدە ساڵی تێپەڕ کردبێت و خوێندنی بنەڕەتی تەواو نەکردبێت.

**دووەم:** هەر کەسێک تەمەنی(24) بیست وچوار ساڵی تێپەڕکردبێت وخوێندنی ئامادەیی تەواو نەکردبێت.

**سێیەم:** هەر کەسێک تەمەنی (28) بیست و هەشت ساڵی تێپەڕ کردبێت و خوێندنی پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی تەواو نەکردبێت.

**چوارەم :** هەر کەسێک لەو تاقیکردنەوانەی کە لە بڕگەکانی (یەکەم، دووەم، سێیەم)ی ئەم ماددەیەدا دەقنووسکراون، دەربچێت، بڕوانامەی تەواوکردنی خوێندنی ئەو بابەتە، یان قۆناغی خوێندنە دیاریکراوەی پێدەدرێت.

## بەشی هەشتەم
## فەرمانبەران و پێکهاتە پەروەردەیی و کارگێڕییەکان لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

---

## تەوەری یەکەم
## بەڕێوەبەر، یاریدەدەری بەڕێوەبەر، مامۆستایان، فەرمانبەران و کارمەندانی دیکە لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

**ماددەی (56):**

**یەکەم:** هەموو باخچەیەکی منداڵانی حکومی، بەڕێوەبەر، مامۆستا و فەرمانبەرانی دیکەی دەبێت، ئەگەر ژمارەی منداڵان لە باخچەیەکدا لە (200) دووسەد منداڵ زیاتر بوو، دەبێت یاریدەدەرێکی بەڕێوەبەر دابنرێت.

**دووەم:** هەموو قوتابخانە و خوێندنگە و کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی حکومی بەڕێوەبەری خۆی دەبێت و ئەگەر ژمارەی قوتابیان و خوێندکاران لە (150) سەد و پەنجا زیاتر بوو، دەبێت یاریدەدەرێکی بەڕێوەبەر، یان زیاتر دابنرێت.

**سێیەم:** هەموو قوتابخانە و خوێندنگە و کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی حکومی ژمارەیەک مامۆستای دەبێت کە لەگەڵ ژمارەی قوتابیان، یان خوێندکارانیدا بگونجێت.

**چوارەم:** وەزارەت کار دەکات بۆ ئەوەی هەموو قوتابخانە و خوێندنگە و کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی حکومی بۆ هەر (200) دوو سەد قوتابی، یان خوێندکارێک، ڕێنماییکارێکی پەروەردەیی هەبێت.

**پێنجەم:** وەزارەت کاردەکات بۆ ئەوەی هەموو قوتابخانە و خوێندنگە و کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی حکومـی کە (200) دوو سـەد قوتابی یان خوێنـدکاری زیاتر هەبوو، خزمەتگوزاریی تەندروستی بۆ دابین بکرێت.

**شەشـەم:** هەمـوو دامەزراوەیەکـی پەروەردەیی حکومی پێویسـتە ژمارەیـەک فەرمانبـەری کارگێڕیـی و خزمەتگوزاریـی هەبێـت، ژمارەکەیان بە ڕێنماییەک دیاریدەکرێت، کە وەزیر دەریدەکات.

**حەوتەم:** هەموو کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی حکومی بەڕێوەبەرێکی کۆمەڵگـەی دەبێـت، بۆ هـەر قۆناغێکی خوێندنیـش بەڕێوەبەرێک دادەنرێت، بەڕێوەبەری کۆمەڵگە بەرپرسی سەرەکی دەبێت لە پرسە ئەکادیمـی و کارگێڕیـی و داراییـەکان و ئەرکی سـەرەکی سـەبارەت بـە سەرپەرشـتیکردنی بەڕێوەچـوون و دابینکردنـی دڵنیایـی جۆریی خوێندن لە قۆناغە جیاوازەکانی کۆمەڵگەکە لە ئەستۆ دەگرێت.

**هەشـتەم:** قوتابخانـە و خوێندنگەکانـی گونـدەکان و شـوێنە دوورەدەسـتەکان، لە مەرجەکانی بڕگەکانی سەرەوەی ئەم ماددەیە بەدەرن و کارەکانیان بە ڕێنمایی ڕێکدەخرێت کە وەزیر دەریدەکات.

## تەوەری دووەم
## ئەرکەکانی بەڕێوەبەر لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

**ماددەی (57):**

بەڕێوەبـەر نوێنەرایەتی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکە دەکات و کارەکانی بریتین لە:-

**یەکـەم:** بەڕێوەبردنـی دامەزراوەکـە، کارکـردن بـۆ فەراهەمکـردنی

ژینگەیەکی کاری تەندروست، پاراستنی سەلامەتی قوتابیان و خوێندکاران و فەرمانبەران و کارمەندانی دامەزراوەکە.

**دووەم:** هەوڵدان بۆ هێنانەئارای کەشی پەروەردە و فێرکاریی گونجاو، کە مایەی بەدیهێنانی ئامانجە خوازراوەکان بێت و کارکردن بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و کارامەیی و گیانی هاوپشتیوانی قوتابیان و خوێندکارانی دامەزراوەکە.

**سێیەم:** بەدواداچوون بۆ بەڕێوەچوونی پرۆسەی پەروەردەیی لە دامەزراوەکە بە شێوەیەکی گونجاو و هەماهەنگیکردن لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی پەیوەندیدار و بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پەروەردە بۆ مسۆگەرکردنی باش بەڕێوەچوونی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە دامەزراوەکەدا.

**چوارەم:** دابەشکردنی بەشە وانەکان بەسەر مامۆستایان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە، دڵنیابوون لە پیادەکردنی پلانی ساڵانەی خوێندنی بابەتە پەیوەندیدارەکان، دابەشکردنی ئەرکەکان بەسەر ئەندامانی بەشی کارگێڕیی و مامۆستایان و فەرمانبەرانی دیکە و دانانی لیژنەی پسپۆر.

**پێنجەم:** دەستپێشخەریکردن بۆ داڕشتنی پلانی ساڵانەی دامەزراوەکە و داڕشتنی پلانی تاقیکردنەوەکان و بەدواداچوون بۆ بەڕێوەچوونیان، مسۆگەرکردنی ئاستێکی باشی خوێندن و کردنەوەی هەموو ئەو تۆمارانەی کە پێویستە لە دامەزراوەکەدا هەبن.

**شەشەم:** هەڵسەنگاندنی کاری مامۆستایان لەناو پۆلەکانی خوێندن، کاری ڕێنماییکارە پەروەردەییەکان و پشتیوانیکردنی مامۆستایان و فەرمانبەرانی دیکە لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان و کارکردن بۆ بەرزکردنەوەی تواناکانیان.

**حەوتەم:** بەرزکردنەوەی نوسراو بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە، سەبارەت بە گواستنەوەی هەر فەرمانبەرێکی پەروەردەیی، وەک

ئـەوەی بەرژەوەنـدی گشـتی دەیخوازێت بـە مەرجێـک هۆکارەکانی پێشـنیارەکە خرابێتنە ڕوو و ئەنجومەنی دامەزراوەکە پێشـنیارەکەی پەسەند کردبێت.

**هەشـتەم:** پێشـنیارکردن بـۆ بەڕێوەبەرایەتیـی پـەروەردە سـەبارەت بە ڕەخسـاندنی هەل بۆ مامۆسـتایان و فەرمانبەرانـی دامەزراوەکە بۆ بەشـداربوون لە خولـی بەهێزکردنی تواناکانیـان و بەرزکردنەوەی نوسراو بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە سەبارەت بە هەر پرسێکی گرنگ کە هەلومەرجەکە بیخوازێت.

## تەوەری سێیەم
## ئەرکەکانی یاریدەدەری بەڕێوەبەر لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

**ماددەی (58):**

**یەکـەم:** ئەرکـی یاریـدەدەری بەڕێوەبـەر بـۆ کاروبـاری کارگێڕیـی، یارمەتیدانی بەڕێوەبەرە لە ئەرکە کارگێڕییەکاندا.

**دووەم :** ئەرکـی یاریـدەدەری بەڕێوەبـەر بـۆ کاروبـاری قوتابیـان یان خوێنـدکاران، یارمەتیدانـی بەڕێوەبـەرە لـە کاروبـاری قوتابیـان و خوێندکارانـدا و یارمەتیدان و ڕێنمایکردنـی قوتابیان و خوێندکاران و هەر ئەرکێکی دیکەش، کە لەلایەن بەڕێوەبەر پێیان بسپێردرێت.

## تەوەری چوارەم
## ئەرکەکانی مامۆستا

**ماددەی (59):**

**یەکەم:** پەروەردەکردن و فێرکردنی قوتابی و خوێندکار بەپێی پڕۆگرامەکانی خوێندن، گەشەپێدانی گیانی داهێنان و خوێندنەوەی بنیاتنەرانەی دەقەکان و ڕەچاوکردنی جیاوازی تواناکانی قوتابیان و خوێندکاران لە کاتی وانە وتنەوەدا.

**دووەم:** پشتیوانیکردنی قوتابی و خوێندکار لە بنیاتنانی بەهاکان و کەسێتی بەهێز و متمانە بەخۆبوون.

**سێیەم:** داڕشتنی پلانی ساڵانەی خوێندنی بابەتەکان و دابەشکردنی بەسەر قوتابیان و خوێندکاراندا.

**چوارەم:** ئامادەکردنی قوتابیان و خوێندکاران بۆ تاقیکردنەوەکان، ئامادەکردنی پرسیارەکان، چاودێریکردن، ڕاستاندنی وەڵامی تاقیکردنەوەکان و دانانی نمرەکان.

**پێنجەم:** گەشەپێدانی زانیاری و توانا خودییەکان لە ڕێگەی بەشداریکردن لە خولە پەروەردەیی و فێرکارییە جۆراوجۆرەکان، بەدواداچوون بۆ بەرەوپێشچوونە هاوچەرخەکان لە بوارەکەی خۆیدا و بەشداریکردن لە فێربوونی بەردەوام و فێرکردنی کەسانی دیکەدا.

**شەشەم:** هەماهەنگی لەگەڵ کارگێڕیی دامەزراوەکە بۆ بەدیهێنانی ژینگەیەکی پەروەردەیی و فێرکردنی باش و چاودێری سەلامەتیی قوتابی و خوێندکار لە کاتی وانە و لەو کاتەی لەژێر سەرپەرشتی مامۆستاداان.

**حەوتەم:** پێدانی ئەو زانیاریانەی کە بەخێوکار سەبارەت بە منداڵەکەی داوای دەکات و ڕێزگرتن و پاراستنی نهێنی و تایبەتمەندی دامەزراوەکە و قوتابیان و خوێندکاران.

**هەشتەم:** پێشکەشکردنی نووسراو و پێشنیاز لەکاتی پێویست

بـە کارگێڕیـی دامەزراوەکە، سـەبارەت بـە چۆنێتی بەرەوپێشـبردنی دامەزراوەکـە و دابینکردنـی دڵنیایـی جـۆری و سـەلامەتی تیایـدا، بەشـداریکردن لـە چالاکـی و ئەرکـە پێویسـتەکان لـە پێنـاو دەستەبەرکردنی بەردەوامیی خوێندن لە ژینگەیەکی تەندروستدا.

**نۆیـەم:** هـەر ئەرکێکـی پەروەردەیـی و فێرکردنـی دیکە کـە لەلایەن بەڕێوەبەرەوە پێی دەسپێردرێت، یان بەپێی هەر ڕێنماییەک کە وەزیر دەریدەکات دەکەوێتە ئەستۆی.

## تەوەری پێنجەم
## ئەرکەکانی ڕێنماییکاری پەروەردەیی

**ماددەی (60):**

**یەکـەم:** ئەرکـی سـەرەکی ڕێنماییـکاری پەروەردەیـی بەدواداچوونە سـەبارەت بە پرسـی قوتابیان و خوێنـدکاران و پشـتگیریکردنیان بۆ چارەسەرکردنی گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانیان لە چوارچێوەی دامەزراوەکەدا و پاراستنی نهێنی و تایبەتمەندێتیان.

**دووەم:** لێکۆڵینـەوە لـە هـۆکاری کێشـەی دەروونـی و ڕەفتـارە ناپەروەردەییەکانـی قوتابیـان و خوینـدکاران و ئاگادارکردنـەوەی کارگێڕیی قوتابخانە یان خوێندنگە.

**سێیەم:** پیشکەشکردنی ڕاپۆرت و ئەنجامدانی توێژینەوە سەبارەت بە کارەکەی خۆی.

# تەوەری شەشەم
# ئەنجومەنی دامەزراوە

**ماددەی (61)**

**یەکەم:** لە هەر قوتابخانە و خوێندنگە و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی حکومی، ئەنجومەنی دامەزراوە پێکدەهێنرێت، بە سەرۆکایەتی بەڕێوەبەر و ئەندامیەتی هەریەک لە:-

1 - یاریدەدەرانی بەڕێوەبەر.

2 - بەرپرسی دڵنیایی جۆریی.

3 - نوێنەرێکی مامۆستایان کە لە سەرەتای هەموو ساڵێکی خوێندندا دەگۆڕدرێت.

4 - ڕێنماییکاری پەروەردەیی، ئەگەر لە دامەزراوەکەدا هەبێت.

**دووەم:** لە کاتی هەبوونی ئەنجومەنی بەخێوکارانی قوتابیان و خوێندکاران، سەرۆکی ئەنجومەنەکە مافی ئامادەبوون و بەشداریکردنی لە گفتوگۆکانی ئەنجومەنی دامەزراوە سەبارەت بە قوتابیان و خوێندکاران هەیە، بێ ئەوەی مافی دەنگدانی هەبێت.

**سێیەم:** ئەنجومەنی دامەزراوە مانگانە و لە کاتی پێویست کۆبوونەوە دەکات و ڕۆژ و کاتی کۆبوونەوەکان لەلایەن بەڕێوەبەر دیاریدەکرێن و پێشوەختە ئەندامانی ئەنجومەنەکەی لێئاگادار دەکرێنەوە.

**چوارەم:** بڕیارەکانی ئەنجومەنی دامەزراوە بەپێی بنەمای زۆرینە دەدرێت، بەبێ ئەوەی ئەو دەسەڵاتانەی بەڕێوەبەر بەپێی یاسا هەیەتی سنوردار بکرێت.

**پێنجەم:** قوتابخانە و خوێندنگەکانی گوند و شوێنە دوورەدەستەکان، بەدەرن لەو مەرجانەی لە بڕگەکانی سەرەوەی ئەم ماددەیەدا هاتوون و کارەکانی ئەو دامەزراوانە بەپێی ڕێنماییەک، کە وەزیر دەریدەکات، ڕێکدەخرێن.

## تەوەری حەوتەم
## ئەرکەکانی ئەنجومەنی دامەزراوە

**ماددەی (62):**

**یەکـەم:** بەدواداچـوون و هەڵسـەنگاندنی وەرزیـی بـۆ کاری دامەزراوەکـە لـەڕووی جێبەجێکردنـی بنەماکانـی دڵنیایـی جـۆری و متمانەبەخشین، بەپێی پێوەر و ستاندارده کارپێکراوەکان.

**دووەم:** بەدواداچوون بۆ ناوەڕۆکی پلانی سـاڵانە و پلانەکانی دیکە و ڕاپۆرتەکانی دامەزراوەکە و پرۆسەی دڵنیایی جۆریی.

**سـێیەم:** بەدواداچـوون بـۆ کاروبـاری دارایـی و کارگێڕیـی و ئەرکـی بەڕێوەبەرە زانیاری پێویسـت سـەبارەت بەو کارانـە بە ئەنجومەنەکە بدات.

**چوارەم:** تاوتوێکردن و پێشنیاری چارەسەرکردنی ئەو پرسە گرنگانەی دامەزراوەکـە کە لەلایـەن بەڕێوەبەرەوە داوا لـە ئەنجومەن دەکرێت تاوتوێیان بکات.

**پێنجەم:** تاوتوێکردنی ئەو پێشـنیازانەی کە بەڕێوەبەری دامەزراوەکە خوازیـارە پێشکەشـی بەڕێوەبەرایەتـی پـەروەردەی قـەزای بـکات سەبارەت بە گواستنەوەی ئەندامانی وانەوتنەوە، یان فەرمانبەرانی دیکـە، ئەوەش دوای خسـتنەڕووی هۆیەکانی تایبـەت بەو داوایە و لـە ئەگەری ڕازیبوونی ئەنجومەن پێشـنیازەکانی بەڕێوەبەر پەسـەند دەکرێن.

**شەشـەم:** پێکهێنانی لیژنەی پێویست لە چوارچێوەی ئەو ئەرکانەی کە لە بڕگەکانی سەرەوەی ئەم ماددەیەدا هاتوون.

تەوەری هەشتەم

مەرجەکانی دانانی بەڕێوەبەر و یاریدەدەری بەڕێوەبەر و دامەزراندنی مامۆسـتا و ڕێنماییـکاری پەروەردەیـی لـە دامـەزراوە پەروەردەییـە حکومییەکاندا

## لقی یەکەم

**مەرجەکانی دانانی بەڕێوەبەر**

**ماددەی (63):**

لە دانانی بەڕێوەبەردا، پێویستە ئەم مەرجانە لە داواکاردا هەبێت:-

**یەکەم:**

1 - بڕوانامەی بەکالۆریۆسی هەبێت و ئەزموونی لە بواری پەروەردە و فێرکردن لە (٥) پێنج ساڵ کەمتر نەبێت.

2 - بەشداری خولی شیاندنی بەڕێوەبەری کردبێت، کە وەزارەت ساڵانە بە هاریکاری لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکانی پەروەردە ڕێکیدەخات.

3 - بە تاوانی ئابڕوبەر حوکم نەدرابێت و سزای بەرزەفتەیی (سەرزەنشت) و زیاتری پێنەدرابێت.

**دووەم:** وەزارەت دەبێت لە ماوەی (4) چوار ساڵدا مەرجەکانی ئەم ماددەیە بەسەر ئەوانەدا جێبەجێ بکات، کە پێش دەرچوونی ئەم یاسایە بەڕێوەبەربوون.

**سێیەم:** بڕگەکانی (یەکەم و دووەم)ی ئەم ماددەیە، بەڕێوەبەرەکانی دامەزراوەی گوندەکان و شوێنە دوورەدەستەکان ناگرێتەوە، مامەڵکردنی ئەوان بەپێی ڕێنماییەک دەبێت کە وەزیر دەریدەکات.

## لقی دووەم

**مەرجەکانی دانانی یاریدەدەری بەڕێوەبەر**

**ماددەی (64):**

**یەکەم:** لە دانانی یاریدەدەری بەڕێوەبەردا، پێویستە ئەم مەرجانە لە داواکاردا هەبێت:-

1 - دەبێت یاریدەدەری بەڕێوەبەری باخچەی منداڵان بڕوانامەیەکی پەروەردەیی هەبێت، کە لە بڕوانامەی بەرایی زانکۆ کەمتر نەبێت.

2 - دەبێت یاریدەدەری بەڕێوەبەری قوتابخانە و خوێندنگە و

پەیمانگـە پەروەردەییـە پیشـەییەکان، بڕوانامەیەکـی پەروەردەیـی هەبێت، کە لە بڕوانامەی بەرایی زانکۆ کەمتر نەبێت و ئەزموونیشی لە بواری پەروەردە و فێرکردندا لە (3) سێ ساڵ کەمتر نەبێت.

3 - بـە تاوانـی ئابڕوبـەر حوکـم نەدرابێـت و سـزای کارگێڕیـی (سەرزەنشت) و زیاتری پێنەدرابێت.

**دووەم:** خاڵەکانـی بڕگـەی (یەکـەم)ی ئـەم ماددەیـە یاریـدەدەری بەڕێوەبەری دامەزراوەی گوند و شوێنە دوورەدەستەکان ناگرێتەوە، مامەڵەکردنی ئەوان بەپێی ڕێنماییەک دەبێت کە وەزیر دەریدەکات.

## لقی سێیەم

## مەرجەکانی دامەزراندنی مامۆستا و ڕێنماییکاری پەروەردەیی

### ماددەی (65):

**یەکەم:**

1 - بـۆ دامەزرانـدنی مامۆسـتا، سـەرەڕای مەرجـە گشـتییەکانی دامەزراندنی هاتوو لە یاسا بەرکارەکاندا، پێویستە داواکار بڕوانامەی زانکۆی لە بواری پەروەردەدا هەبێت.

2 - بـۆ دامەزرانـدنی ڕێنماییـکاری پەروەردەیـی، سـەرەڕای مەرجـە گشـتییەکانی دامەزرانـدنی هاتـوو لـە یاسـا بەرکارەکانـدا، داواکار دەبێـت بڕوانامـەی بەرایی زانکۆی هەبێت لە یەکێک لە بەشـەکانی کۆمەڵنـاسی، دەروونناسی، کاری کۆمەڵایەتی، یـان ڕێنماییکاری دەروونـی، یـان هـەر پسـپۆڕییەکی دیکـەی هاوشـێوە کە بـۆ کاری ڕێنماییکاریی گونجاوبێت.

**دووەم:**

1 - دەکرێـت هەڵگـرانی بڕوانامەی بەرایی زانکۆ، هاوشـێوە و نزیک لە بواری پەروەردە، وەک مامۆسـتا دابمەزرێن، بەمەرجێک وەزارەت داواکارییەکانیان پەسەند بکات.

2 - دەکرێـت هەڵگـرانی بڕوانامـەی دبلـۆم لەکاتی پێویسـتدا وەک

مامۆستا لە قەزا، شارۆچکە، گوند و شوێنە دوورەدەستەکان دابمەزرێن.

**سێیەم:**

1 - لەکاتی دامەزراندنی یەکەمجاری مامۆستادا، مەرجە بۆ ماوەیەک کە لە (5) پێنج ساڵ کەمتر نەبێت، لە شوێنە دوورەکان خزمەت بکات، هیچ مامۆستایەک ڕاستەوخۆ لە شارەکان دانامەزرێت، هیچ مامۆستایەکیش پێش تەواوکردنی ئەو ماوەیە بۆ شارەکان ناگوێزرێتەوە.

2 - مامۆستایانی خوێندنی زمانی پێکهاتەکان، لەکاتی دامەزراندنیان لە مەرجی خزمەت لە شوێنە دوورەکان بەدەردەکرێن، ئەگەر ناوەندێکی خوێندن بە زمانی پێکهاتەکە لەو شوێنانە بوونی نەبێت.

3 - وەزیر بەدەر لە حوکمی خاڵی (1)ی ئەم بڕگەیە دەسەڵاتی گواستنەوەی مامۆستایانی خاوەن پێداویستی تایبەت و ئەو مامۆستایانەی هەیە کە نەخۆشی شێرپەنجەیان هەیە.

**چوارەم**: مامۆستا و ڕێنماییکاری پەروەردەیی دوای دامەزراندن، خولی پەروەردە و فێرکردن و دڵنیایی جۆریی، کە وەزارەت ساڵانە ڕێکیدەخات، دەبینن.

## تەوەری نۆیەم
## ڕێکارەکانی دامەزراندنی مامۆستا، ڕێنماییکاری پەروەردەیی و فەرمانبەرانی دیکە لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

**ماددەی (66):**

**یەکەم:** مامۆستا، ڕێنماییکاری پەروەردەیی و فەرمانبەرانی دیکەی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان، بەپێی یاسا کارپێکراوەکان دادەمەزرێن.

**دووەم:** ئەنجومەنی پەروەردە لە قەزا ئامادەکردنی ناوی پاڵێوراوان و ناردنیان بۆ وەزارەت لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پەروەردەوە، ئەنجام دەدات.

**سێیەم:** خاڵەکانی بەرایی و شێوازی هەڵبژاردنی پاڵێوراوان، کە لە بڕگەی (دووەم)ی ئەم ماددەیەدا ئاماژەی پێکراوە، لە ڕێگەی ڕێنماییەک ڕێکدەخرێت کە وەزیر دەریدەکات.

**ماددەی (67):**

**یەکەم:** وەزارەت دەتوانێت دوای ڕەزامەندی ئەنجومەنی وەزیران، هەڵگرانی بڕوانامەی زانکۆیی بواری پەروەردە و هاوشێوە و نزیک، بەگرێبەست و بەرامبەر شایستەیەکی دارایی دیاریکراو دابمەزرێنێت، دەبێت ئەو مامۆستایانەی بە گرێبەست دادەمەزرێن لە مامۆستایانی وانەبێژبن.

**دووەم:**

1 - وەزارەت دەتوانێت بەپێی ڕێنماییەکانی وەزارەتی دارایی و ئابووری، هەڵگرانی بڕوانامەی زانکۆیی بواری پەروەردە و هاوشێوە و نزیک و هەڵگرانی بڕوانامەی دیپلۆمی بواری پەروەردە، لە گوند و شارەدێ و شوێنە دوورە دەستەکان و لە شارەکانیش بەپێی

پێویستی، بەرامبەر شایستەیەکی دارایی گونجاو، وەك وانەبێژ دابنێت.
2 - وەزیر بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزیری دارایی و ئابووری، ڕێنمایی پێویست بە شایستە داراییەکانی وانەبێژان و مافەکانیان و مەرج و ڕێکارەکانی دامەزراندنیان بە گرێبەست بەپێی حوکمەکانی بڕگەی (یەکەم)ی ئەم ماددەیە، دیاریدەکات.
**سێیەم:** وەزارەت بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی دارایی و ئابووری، بڕی کرێی وانەبێژیی لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا دیاریدەکات.

## تەوەری دەیەم

### ڕێکارەکانی دانانی بەڕێوەبەر و یاریدەدەری بەڕێوەبەر لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

**ماددەی (68):**
**یەکەم:** دانانی بەڕێوەبەر و یاریدەدەری بەڕێوەبەر لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان لە ڕێگەی بڕیارێک دەبێت کە بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردە لەبەر ڕۆشنایی ڕێنماییە کارپێکراوەکان، لەسەر بنەمای پێشنیاری ئەنجومەنی پەروەردەی قەزا دەیدات، بەڕێوەبەری گشتی پەروەردە ناتوانێت بێ پاساوی ڕەوا پێشنیاری ئەنجومەن ڕەتبکاتەوە.
**دووەم:** دەبێت ڕەچاوی بڕوانامە و لێهاتویی و ئەزموون و کارامەیی و هاوسەنگی نێوان هەردوو ڕەگەز لە کاتی دانانی بەڕێوەبەر و یاریدەدەری بەڕێوەبەردا، بکرێت.
**سێیەم:** ماوەی دانانی بەڕێوەبەر (4) چوار ساڵە، دەشکرێت بۆ تەنها جارێک نوێبکرێتەوە.

## تەوەری یازدەیەم
## کۆتاپێهێنانی کاری بەڕێوەبەر

**ماددەی (69):**

کاری بەڕێوەبـەر لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان، لەم بارانەی خوارەوەدا کۆتایی پێدێت:-

**یەکەم:** کۆتایهاتنی ماوەی یاسایی.

**دووەم**: دەستلەکارکێشانەوەی ئارەزوومەندانە.

**سێیەم**: ساغبونەوەی ئەوەی کە ناتوانێت ئەرکەکانی بەجێبێنێت، جا لەبەر هەر هۆیەک بێت.

**چـوارەم**: سـزادانی بە تاوانــی ئابڕوبەر، یاخود سـزایەکی کارگێڕی کە (سەرزەنشت) و زیاتر بێت.

**پێنجەم**: ئەگەر (2) دوو ساڵ لەسەر یەک لە پرۆسەی هەڵسەنگاندنی دەرەکیدا، دامەزراوە پەروەردەییەکە ئاستێکی نزم بە دەستبهێنێت.

**شەشـەم**: وەرگرتنــی مۆڵەتــی لە (6) شـەش مانگ زیاتـر، بەدەر لە مۆڵەتی دایکایەتی کە بۆ ماوەی یەک ساڵە.

## تەوەری دوازدەیەم
## تواناسازی مامۆستایان و فەرمانبەران

**ماددەی (70):**

**یەکەم**: بەڕێوبـەر، یاریدەدەری بەڕێوەبەر، مامۆسـتا و ڕێنماییکاری پەروەردەیـی لە دامـەزاروە پەروەردەییـە حکومییەکاندا لانیکەم (30) سـی کاتژمێر لە سـاڵێکدا مافی بەشـداریکردن لە خولی پەرەپێدانی توانا پیشەییەکانیان هەیە.

**دووەم**: پێویسـتە وەزارەت هـەل بـۆ پەرەپێدانــی بەردەوامی توانای

سـەرکردایەتی بەڕێوەبەر و یاریدەدەری بەڕێوەبەر و توانای زانستی و پیشەیی مامۆستایان و فەرمانبەران بڕەخسێنێت.

**ماددەی (71):**

هەڵگرانی بڕوانامەی دبلۆمی باڵا ، ماسـتەر و دکتۆرای هاوتاکراو لە وەزارەتـی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانسـتی، هەموو ئەو ماف و جیاوگانەیان پێدەدرێـت، کە هاوتاکانیان لە وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، بە پێی یاسا کارپێکراوەکان، پێیاندراوە.

## تەوەری سێزدەیەم
## بەشە وانەکان و دابەشکردنیان لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

### لقی یەکەم
### بەشەوانەکان لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

**ماددەی (72):**

**یەکـەم**: ژمارەی بەشـە وانەی مامۆسـتایان لـە هەفتەیەکـدا، بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:-

1 - مامۆسـتایانی قۆناغـی خوێندنـی بنەڕەتی (24) بیسـت و چوار بەشە وانەیە.

2 - مامۆسـتایانی قۆناغـی خوێندنی ئامادەیی (22) بیسـت و دوو بەشە وانەیە.

3 - بەڕێوەبەر (4) چوار بەشە وانەیە.

4 - یاریدەدەری بەڕێوەبەر (8) هەشت بەشە وانەیە.

5 - مامۆسـتای خاوەن بڕوانامەی دبلۆمی باڵا (20) بیسـت بەشـە وانەیە.

6 - مامۆستای خاوەن بڕوانامەی ماستەر (18) هەژدە بەشە وانەیە.

7 - مامۆستای خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا (14) چواردە بەشە وانەیە.

**دووەم**: بەشە وانەکان بەپێی پسپۆڕی و پێداویستیی دامەزراوەکە دابەش دەکرێن.

**سـێیەم**: ژمارەی بەشەوانەکانی دەقنووسکراو لە بڕگەی (یەکەم)ی ئەم ماددەیە، لەم بارانەی خوارەوەدا بەم شێوەیە کەمدەکرێنەوە:-

1 - (2) دوو بەشـە وانە بۆ ئەو مامۆسـتایانەی کـە لە خاڵەکانی (1، 2، 3، 5، 6، 7)ی بڕگـەی (یەکـەم)دا هاتـوون، کـە تەمەنیان دەگاتە (50) پەنجا ساڵ.

2 - (4) بەشە وانە بۆ یاریدەدەری بەڕێوەبەر کە تەمەنی دەگاتە (50) ساڵ.
3 - (4) بەشە وانە بۆ ئەو مامۆستایەی کە بەپێی ماددەی (88/ دووەم)ی ئەم یاسایە ئەرکی دڵنیایی جۆریی پێدەسپێردرێت.
**چوارەم**: وەزیر دەتوانێت ژمارەی بەشە وانەکانی هاتوو لە بڕگەکانی (یەکەم) و (سێیەم)ی ئەم ماددەیە کەمتربکاتەوە، بۆ مامۆستایانی خاوەن پێداویستی تایبەت و ئەو مامۆستایانەی نەخۆشی شێرپەنجەیان هەیە.

## لقی دووەم
## دابەشکردنی ژمارەی بەشەوانەکان لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا

### ماددەی (73)
**یەکەم**: ژمارە و شێوازی دابەشکردنی بەشە وانەکان لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا، لەلایەن ئەنجومەنی وەزارەتەوە، ساڵانە و پێش کۆتاییهاتنی مانگی تەمموز پەسەند دەکرێت.
**دووەم**: ئەگەر مامۆستایەک، نەیتوانی گشت ئەو بەشە وانانەی، لە دامەزراوە پەروەردەییە پەیوەندیدارەکەدا بۆی تەرخانکراوە بڵێتەوە، ئەوا دەبێت پاشماوەی بەشە وانەکانی لە دامەزراوەیەکی پەروەردەیی حکومی دیکەدا تەواو بکات.
**سێیەم**: لە هیچ دامەزراوەیەکی پەروەردەیی حکومی، کرێی وانەبێژیی بۆ هیچ مامۆستایەک هەژمار ناکرێت، ئەگەر مامۆستای میلاک و گرێبەستی دامەزراوەکە تەواوی بەشەوانەکانی خۆی نەوتبێتەوە.
**چوارەم**: مامۆستایانی گوند و شوێنە دوورەدەستەکان حوکمەکانی ماددەی (72) و بڕگەی (دووەم)ی ئەم ماددەیە، نایانگرێتەوە.

**ماددەی (74)**

**یەکـەم**: وتنەوەی وانـەی تایبەت لەلایەن مامۆسـتایانی دامەزراوە پەروەردەییـە حکومییەکانـەوە، لـە دەرەوەی دامەزراوەکـە، بەرامبەر بڕە پارەیەک، یان هەر بەرامبەرێکی دیکە، بە قوتابیان و خوێندکارانی هەمان ناوەندی خوێندن، کە خۆی تێیدا مامۆستایە، قەدەغەیە، بە ڕەچاوکـردنی ئـەو هەلومەرجە تایبەتەی لە بڕگـەی (دووەم)ی ماددە (130)ی ئەم یاسایەدا هاتووە.

**دووەم**: ئەو مامۆستایەی سەرپێچی بڕگەی (یەکەم)ی ئەم ماددەیە بـکات، سـەرەتا لەلایـەن بەڕێوەبەرایەتـی پەیوەندیـدار بـە نووسراو ئـاگادار دەکرێتـەوە و لەکاتـی دووبارەکردنـەوەی سـەرپێچییەکە، بەپێـی یاسـا کارپێکراوەکان یەکێک لە سـزا کارگێڕییەکانی بەسـەردا دەسەپێنرێت.

**سـێیەم**: بەکارهێنانـی نـاوی دامەزراوەیەکـی پەروەردەیـی حکومی بـۆ کاری بازرگانی، لەلایەن دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومی یان کەسانی دیکەوە، قەدەغەیە.

**چـوارەم**: پرۆگرامـەکان و کتیبەکانی خوێندن مـاف و خاوەندارێتی دەگەڕێتـەوە بـۆ وەزارەت، بـە هیـچ شـێوەیەک نابێت بەبـێ بڕیاری فەرمی وەزارەت کورت بکرێتەوە، یان دەستکاری بکرێت.

# تەوەری چواردەیەم
# لیژنەکانی قوتابخانە و خوێندنگە و پەیمانگە حکومییەکان

**ماددەی (75)**

لە گشت قوتابخانە، خوێندنگە، کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی حکومی، بە بڕیاری بەڕێوەبەرەکەی، ئەم لیژنانە پێک دەهێنرێن:-

**یەکەم**: لیژنەی دڵنیایی جۆری.

**دووەم**: لیژنەی تاقیکردنەوەکان.

**سێیەم**: لیژنەی وردبینیکردنی نمرەکان.

**چوارەم**: لیژنەی کارگێڕی.

**پێنجەم**: لیژنەی هونەری بۆ کاروباری وەرزشی، هونەری و ئەدەبی و چالاکییەکان.

**شەشەم**: لیژنەی ژینگە و پاکوخاوێنی و بەدواداچوونی تەندروستی.

**حەوتەم**: لیژنەی بەرزەفتکردنی کار و ڕەفتارە ڕێپێنەدراوەکان.

**هەشتەم**: هەر لیژنەیەکی دیکە، کە وەزارەت بەپێویستی دەزانێت و دامەزراوەکانی لێئاگاداردەکاتەوە.

## بەشی نۆیەم
## پلانی فێرکردن و پڕۆگرامەکانی خوێندن

---

## تەوەری یەکەم
## پلانی فێرکردن

**ماددەی (76):**

**یەکـەم**: پلانــی فێرکـردن لـە دامـەزراوە پەروەردەییـە حکومییـەکان لەلایەن ئەنجومەنی وەزارەتەوە بڕیاری لێدەدرێت.

**دووەم**: دەبێت پلانی فێرکردن ئەم تەوەرانە لەخۆبگرێت:-

1 - بنەما گشتییەکان .

2 - بەهاکان.

3 - ئەو ئامانجانەی دەبێت لە هەر بازنەیەکدا بۆ منداڵان و قوتابیان و خوێندکاران، دیاریبکرێت.

4 - ئـەو کارامەییانەی لە منداڵان و قوتابیـان و خوێندکاران چاوەڕێ دەکرێن.

5 - ئـەو بابەتانـەی خوێنـدن کـە دەبێـت بخوێندرێـن لە هـەر بازنە و قۆناغێکدا و هەروەها ناوەڕۆکی سەرەکی بابەتەکە و ئامانجەکەی.

6 - ژمارەی بەشە وانەکان بۆ هەر بابەتێک لە ساڵێکدا.

## تەوەری دووەم
## پڕۆگرامەکانی خوێندن

**ماددەی (77):**

**یەکەم**: پێویستە هەریەک لە باخچەی منداڵان، خوێندنی بنەڕەتی، خوێندنی ئامادەیی، پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییەکان، خوێندنی خێرا و نەهێشتنی نەخوێندەواریی، پرۆگرامی خوێندنی تایبەت بە خۆیان هەبێت، کە لەگەڵ توانستەکانی منداڵ و قوتابی و خوێندکار لەهەر قۆناغ و بازنەیەکدا بگونجێت.

**دووەم**: پرۆگرامی خوێندن بریتیە لە:-

1 - بەشێکی پلانی فێرکردن کە پەیوەستە بە قۆناغێکی خوێندن یان بازنەیەکی دیاریکراو.

2 - کتێبەکانی خوێندن لەهەر بابەتێک.

3 - کتێبەکانی ڕاهێنان.

4 - ڕێبەری مامۆستا.

5 - ڕێبەری سەرپەرشتیاری پەروەردەیی.

6 - ڕێبەری سیستەمی تاقیکردنەوەکان و هەڵسەنگاندن.

**سێیەم**: پرۆگرامەکانی خوێندن بۆ هەر بازنە و قۆناغێک لەلایەن وەزارەتەوە بڕیاری لێدەدرێت، بە سوودوەرگرتن لە کەسانی پسپۆڕ و ئەزموونە جیهانییە سەرکەوتووەکان.

**چوارەم**: ئەرکی ئەنجومەنی وەزارەتە، کە لانیکەم هەر (٤) چوار ساڵێک، لەسەر پێشنیاری لیژنەی پسپۆڕ لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرامەکانی خوێندن، بە ڕێگە و میکانیزمی زانستی گونجاو، بە مەبەستی هەڵسەنگاندن و پەرەپێدانی پرۆگرامەکانی خوێندن، پێداچوونەوە بە پرۆگرامەکاندا بکات.

**ماددەی (78):**

بەڕێوەبەرایەتیی گشـتیی پرۆگرامەکانی خوێندن، دوای ڕاسـپاردەی نووسەرانی کتێبەکان و پسپۆڕان و پاش ڕەزامەندی وەزارەت، مافی گۆڕانکاری لە ناوەڕۆکی کتێبەکانی خوێندندا هەیە.

# بەشی دەیەم
# تاقیکردنەوە، نمرەی دەرچوون، کارتی نمرە و بڕوانامەکان

---

## تەوەری یەکەم
## ئامانجەکان

**ماددەی (79):**

ئامانجی تاقیکردنەوەکان بریتییە لە:-

**یەکـەم**: پێوانە و هەڵسـەنگاندن سـەبارەت بە ئاسـتی بەدیهێنانی ئامانجە پەروەردەیی و فێرکارییەکان.

**دووەم**: پێوانـەی ئاسـتی بەرەوپێشـچوون و فێربوونـی قوتابیان و خوێنـدکاران، لـە بواری پەروەردەیـی و فێرکردن لـە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە.

**سـێیەم**: هەڵسـەنگاندنی ئاسـتی سـەرکەوتنی مامۆسـتایان و بەڕێوەبـەران و کارمەندانـی دیکـەی دامـەزراوەکان لـە پرۆسـەی پەروەردە و فێرکردندا.

**چوارەم**: دانانی پلانی داهاتوو بۆ گەشەپێدانی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن، لەسەر بنەمای ئەنجامی تاقیکردنەوەکان.

## تەوەری دووەم
## بنەمای تاقیکردنەوەکان

**ماددەی (80):**

**یەکـەم**: تاقیکردنـەوەکان لەسـەر ناوەڕۆکـی بابەتەکانـی خوێنـدن بنیاتدەنرێن.

**دووەم**: کتێبـە بڕیارلێدراوەکانـی خوێنـدن تەنهـا سـەرچاوەن بـۆ تاقیکردنەوەکان.

**سـێیەم**: سـزا کارگێڕییەکانـی گزیکـردن بـە ڕێنمایـی ڕێکدەخرێن کە وەزیر دەریدەکات.

## تەوەری سێیەم
## تاقیکردنەوەکان

**ماددەی (81):**

وردەکاریی تاقیکردنەوە لە دامەزراوە پەروەردەییەکاندا، بە پەیڕەوێک ڕێکدەخرێت، کە ئەنجومەنی وەزیران دەریدەکات.

**ماددەی (82):**

**یەکـەم**: وەزیـر دەبێـت سـاڵانە لیژنـەی بـاڵای تاقیکردنـەوەکان لە کەسانی پسپۆڕ و بە ئەزموون پێکبهێنێت.

**دووەم**: لیژنـەی بـاڵای تاقیکردنـەوەکان بەرپرسـە لـە بەڕێوەبردنـی تاقیکردنـەوە سەرتاسـەرییەکان، دانانـی پرسـیارەکانیان، پاراسـتنی نهێنییەکانیـان، پێشـنیازکردنی ڕێنمایـی بـۆ ڕێکخسـتنی ئەنجامـی تاقیکردنـەوەکان، سـەلامەتی ڕاگەیاندنـی ئەنجامەکانیـان و یەکلاکردنەوەی تانەکان.

**مادده‌ی (83):**

**یه‌که‌م**: هه‌رکه‌سێک دزه به پرسیاری تاقیکردنه‌وه‌کان بکات، یان زانیاریی له باره‌یانه‌وه بدرکێنێت، یان مامه‌ڵه‌ی پێوه بکات، به به‌ندکردن بۆ ماوه‌یه‌ک که له (٣) سێ ساڵ که‌متر نه‌بێت سزا ده‌درێت.

**دووه‌م**: ئه‌گه‌ر که‌سی هاتوو له بڕگه‌ی (یه‌که‌م)ی ئه‌م مادده‌یه، ئه‌ندامی لیژنه‌ی تاقیکرنه‌وه‌کان بوو، یان تایبه‌تمه‌ندبوو به گواستنه‌وه یان پاراستن یان هه‌ڵگرتنیان، سزاکه‌ی ده‌بێته دوو هێنده و به تاوانی ئابڕوبه‌ر ئه‌ژمار ده‌کرێت و له وه‌زیفه‌ش ده‌رده‌کرێت.

**سێیه‌م**: ئه‌گه‌ر تاوانبار فه‌رمانبه‌ر یان کارمه‌ندێکی دیکه‌ی حکومه‌ت بوو، هه‌مان حوکمی بڕگه‌ی (دووه‌م)ی ئه‌م مادده‌یه‌ی له‌سه‌ر جێبه‌جێ ده‌کرێت.

**چواره‌م**: ئه‌م تاوانه به تێپه‌ڕبوونی کات خه‌سڵه‌تی تاوانکاری له‌ده‌ست نادات.

## ته‌وه‌ری چواره‌م
## پشتڕاستکردنه‌وه‌ی به‌ڵگه‌نامه‌ی ده‌رچوون

**مادده‌ی (84):**

**یه‌که‌م**: پێویسته به‌ڕێوبه‌رایه‌تی په‌روه‌رده به‌بێ به‌رامبه‌ر ڕاستاندن بۆ به‌ڵگه‌نامه و بڕوانامه‌ی ده‌رچوون، له کاتی به‌کارهێنانی له‌ناو وڵاتدا بکات.

**دووه‌م**: پێویسته وه‌زاره‌ت به‌رامبه‌ر به ڕه‌سمێک ڕاستاندن بۆ به‌ڵگه‌نامه و بڕوانامه‌ی ده‌رچوون بکات له‌کاتی بردنی بۆ ده‌ره‌وه‌ی وڵات.

## بەشی یازدەیەم
## سیستەمی دڵنیایی جۆریی، سەرپەرشتیکردن و هەڵسەنگاندن

**ماددەی (85):**

سیستەمی دڵنیایی جۆریی، لە بەشی کارگێڕیی دامەزراوەکان، مامۆستا، قوتابی و خوێندکار، ڕێگەکانی وانەوتنەوە، پرۆگرامەکانی خوێندن و ژینگەی خوێندن پێکدێت.

## تەوەری یەکەم
## بەرپرسیارێتی دڵنیایی جۆریی لە وەزارەت

**ماددەی (86):**

**یەکەم**: وەزارەت لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن بەرپرسە لە جێبەجێکردنی بنەماکانی دڵنیایی جۆریی و متمانەبەخشین، لەبەر ڕۆشنایی پێوەر و ستانداردی زانستیدا و بەرپرسیارە لە پەرەپێدانی بەردەوامی توانای کارمەندانی پەروەردە و فێرکردن.

**دووەم**: لە پرۆسەی دڵنیایی جۆریدا، فیدباکی قوتابی و خوێندکار، مامۆستایان و فەرمانبەران و کارمەندانی دامەزراوەکە، وەردەگرێت.

**ماددەی (87):**

**یەکەم**: ڕێبەری دڵنیایی جۆریی لەلایەن وەزارەت بڵاودەکرێتەوە، وێنەیەکی لای دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان دەپارێزرێت و دەبێتە سەرچاوەی سەرەکی بۆ پیادەکردن و بەدواداچوونی بەڕێوەچوونی پرۆسەی دڵنیایی جۆریی.

**دووەم**: بەمەبەستی هەڵسەنگاندنی کارمەندان و خودی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان لە ڕووی کارگێڕیی و ژینگەییەوە، وەزارەت بەر لە کۆتایی مانگی ئایاری هەر ساڵێک، فۆڕمی وەکیەکی هەڵسەنگاندن بەسەر دامەزراوەکاندا دابەش دەکات، ئەو فۆڕمانە دەبنە بنەمایەک بۆ خود هەڵسەنگاندن و هەڵسەنگاندنی دەرەکی ناو بەناو لەلایەن دامەزراوەکانەوە و دەبنە بنەمایەکیش بۆ ڕاپۆرتی سەرپەرشتیاران.

**سێیەم**:

1 - بەمەبەستی بەدواداچوون بۆ بەڕێوەچوونی پرۆسەی دڵنیایی جۆریی و پیادەکردنی بە باشترین شێوە، بەڕێوەبەرایەتییەکی کارگێڕیی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن لە پارێزگاکان و ئیدارە سەربەخۆکان دادەمەزرێت.

2 - ئەو بەڕێوەبەرایەتییە لە کۆتایی هەردوو وەرزەکانی یەکەم و دووەم، زانیاری سەبارەت بە پرۆسەی دڵنیایی جۆری کۆدەکاتەوە، لەسەر بنەمای ئەوە، پوختەیەک لەسەر پابەندی دامەزراوەکان لە کۆتایی ساڵی خوێندن پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن دەکات.

## تەوەری دووەم
## بەڕێوەبردنی سیستمی دڵنیایی جۆریی
## لە دامەزراوەکاندا

**ماددەی (88):**

**یەکەم**: بەڕێوەبەری دامەزراوە بەرپرسە لە جێگیرکردنی سیستەمی دڵنیایی جۆریی لە دامەزراوە، سەرپەرشتیکردنی بەڕێوەچوونی پرۆسەکە بەپێی یاسا و ڕێنماییەکان و پیادەکردنی ڕێبەری دڵنیایی جۆریی، ئەوەی کە لەلایەن وەزارەتەوە ئامادە و دابەش دەکرێت.

**دووەم**: ئەنجومەنی دامەزراوە یەکێک لە ئەندامەکانی، دوای بەشداریکردنی لە خولی ڕاهێنان، بە بەرپرسیارێتیی سەرپەرشتیکردن و بەدواداچوونی بەڕێوەچوونی پرۆسەی دڵنیایی جۆریی ڕادەسپێرێت.

**سێیەم**: هەر مامۆستایەک، پێویستە بە گیانی هاوکاری لە پیادەکردنی پرۆسەی دڵنیایی جۆریی بەشدار بێت و کار بکات بۆ سەرکەوتنی پرۆسەکە لەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە ئەرکەکانیەوە.

## تەوەری سێیەم
## سیستمی دڵنیایی جۆری لە دامەزراوەکاندا

**ماددەی (89):**

**یەکەم**: پێویستە هەموو دامەزراوەکان، بەر لە کۆتایی مانگی ئایاری هەر ساڵێک و لە ڕێگەی پڕکردنەوەی فۆرمێکی وەکیەکی دڵنیایی جۆریی کە وەزارەت دایدەڕێژێت و دابەشی دەکات، ساڵانە بۆ ئاستی فێربوونی قوتابیان و خوێندکاران، پابەندی کادیرانی وانەوتنەوە و کارگێڕیی، بەڕێوەچوونی کاری دامەزراوەکە، چالاکییە جۆراوجۆرەکان و ئاستی سەرکەوتنیان لە پیادەکردنی سیستەمی دڵنیایی جۆریی، هەڵسەنگاندن بکەن.

**دووەم**: پوختەیەک لە فۆڕمەکانی هەڵسەنگاندن، لەگەڵ بەڵگەکان و پێداویستییەکان بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکان بەرزدەکرێتەوە و هەڵسەنگاندنەکە دەبێتە بنەمای بابەتیانەی پرۆسەی هەڵسەنگاندن.

**سێیەم**: مافی هەر کەسێکە کە بەرژەوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەبێت، وێنەیەکی ڕاپۆرتی کۆتایی هەر دامەزراوەیەک بەدەستبهێنێت، لە ڕێگەی داوایەک کە پێشکەشی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن دەکرێت.

**چوارەم**: ئەگەر کەموکوڕی لە کاری دامەزراوەکە بەدیکرا و لەکاتی دیاریکراودا چارسەر نەکرا، ئەوا ئەرکی وەزارەتە ڕێکاری پێویست بەرامبەر دامەزراوەکە بگرێتەبەر.

## تەوەری چوارەم
## ڕێبەری دڵنیایی جۆریی

**ماددەی (90):**

**یەکەم:**

1 - وەزارەت ڕێبـەری دڵنیایـی جۆریی لە بواری پـەروەردە و فێرکردنندا بڵاودەکاتەوە.

2 - ڕێبەری دڵنیایی جۆریی پێناسەی دڵنیایی جۆریی و سیستمەکەی، بەڕێوەبردنی سیستەمی دڵنیایی جۆریی لە وەزارەت و دامەزراوەکان و نیشـاندەرەکانی دڵنیایـی جـۆری لـە وانەوتنـەوە، بەڕێوەبردنـی دامـەزراوەکان، شـێوازەکانی وانەوتنـەوە، پرۆگرامـەکان، ژینگـەی دامەزراوەکـە، پێکهاتەکانـی هەگبـەی مامۆسـتا، دیاریکردنی ڕۆڵی بەخێوکاران لە پرۆسـەی دڵنیایی جۆریـی، نموونەیەکی فۆرمەکانی هەڵسـەنگاندن و چۆنیەتـی پڕکردنەوەیـان لەلایـەن کارمەندانـی دامەزراوەکان، لە خۆدەگرێت.

**دووەم**: دەبێت ڕێبەری دڵنیایی جۆریی پێش دەسـتپێکردنی سـاڵی خوێنـدن لەلایەن وەزارەتەوە ئامادە بکرێت و بەسـەر دامەزراوەکاندا دابەش بکرێت.

## تەوەری پێنجەم
## هەگبەی مامۆستا و بەڕێوەبەر و یاریدەدەری بەڕێوەبەر

**ماددەی (91):**

**یەکـەم**: هـەر مامۆسـتا و بەڕێوەبـەر و یاریـدەدەری بەڕێوەبەرێک،

هەگبەیەکی تایبەت بە خۆی دەبێت بۆ کۆکردنەوەی بەڵگە تایبەتییەکان سەبارەت بە باش بەڕێوەچوونی کارەکانیان.

**دووەم**: هەگبە ئەمانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:-

1 - فێربوونی بەردەوام لە ڕێگەی ئاشنابوون بە گەشەکردنەکانی بواری پەروەردە و فێرکردن.

2 - سازدانی سیمیناری پەروەردەیی و فێرکردن، یان بەشداربوون تێیاندا.

3 - ئەنجامدانی ڕاپۆرت و توێژینەوەی پەروەردەیی و فێرکردنی جیاواز.

4 - بەشداریکردنی مامۆستا لە کارەکانی دامەزراوەکەی بۆ سەرخستنی ئەرکەکانی و بەرەوپێشبردنی لە هەموو بوارەکاندا.

**سێیەم:** وەزارەت مافی زیادکردنی پێکهاتەی دیکەی بۆ هەگبە هەیە و دەبێت بەڕێنمایی ڕێکبخرێت کە وەزیر دەریدەکات.

## تەوەری شەشەم
## هەڵسەنگاندنی ساڵانەی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان و فەرمانبەرەکانیان

**ماددەی (92):**

**یەکەم**:

1 - کارمەندانی پەروەردەیی و فێرکردن و کارمەندانی کارگێڕیی، ساڵانە لەلایەن بەڕێوەبەری دامەزراوەکەوە، هەڵسەنگاندنیان لە بوارە جیاوازەکاندا بۆ دەکرێت.

2 - ئەنجامەکانی پرۆسەی هەڵسەنگاندن لە تۆمارەکانی دامەزراوەکە تۆماردەکرێن و پوختەیەکی لە شێوەی فۆرمێک بۆ بەڕێوەبەرایەتیی

گشـتیی پـەروەردەی پارێزگاکان و ئیـدارە سـەربەخۆکانی و وەزارەت دەنێردرێت.
3 - هەڵسـەنگاندنی سـاڵانە بۆ دیاریکردنی خاڵە بەهێز و لاوازەکانی کارمەنـدان و دامەزراوەکـە دەکرێـت و وەک بنەمایـەک بـۆ پێشکەشکردنی سوپاس و پێزانین بەکاردێت.
**دووەم**: هـەر دامەزراوەیـەک لەلایـەن لیژنەیەکـی هەڵسـەنگاندنی دەرەکـی سـەر بـە وەزارەت و بەپێـی پێوەرەکانـی وەزارەت و فۆڕمی تایبەت، کە بەر لە دەسـتپێکی ساڵی خوێندن بەسەر دامەزراوەکاندا دابـەش دەکرێـت، هەڵسـەنگاندنیان بـۆ دەکرێـت، ئەنجامـی ئـەو هەڵسـەنگاندنە وەک هەڵسـەنگاندنی بەڕێوەبـەر و دامەزراوەکـە هەژمار دەکرێت.

## تەوەری حەوتەم
## پرۆسەی هەڵسەنگاندن و دەرهاوێشتەکانی

**ماددەی (93):**
**یەکەم**: ئەرکی بەڕێوەبەرایەتی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشـتیکردنە، فۆرمەکانـی هەڵسـەنگاندن کۆبکاتـەوە، کورت و پوختیـان بکات، تۆمار و شیکردنەوەیان بۆ بکات و سوودیان لێ وەربگرێت .
**دووەم**: ئاسـتی کارایـی هـەر دامەزراوەیـەک بەپێـی زانیـاری و بەڵگەکانی ڕاپۆرتی سـاڵانە دەبێت و دامـەزراوەکان بەم جۆرە پۆلێن دەکرێن:-
1 - ئاستی یەکەم: پێویستی بە پشتیوانی گەورەیە.
2 - ئاستی دووەم: پێویستی بە پشتیوانیە.
3 - ئاستی سێیەم: ناوەندە.
4 - ئاستی چوارەم: باشە.

**سێیەم**: هەر کارمەندێکی پەروەردەیی و فێرکردن، لە هەر دامەزراوەیەک، بەپێی هەڵسەنگاندنی هەگبەکەی پۆلێن دەکرێت بۆ:-

1 - پێویستی بە پشتیوانیە.

2 - پەسەندە.

3 - ناوەندە.

-4 باشە.

5 - زۆر باشە.

6 - نایابە.

**چوارەم**: وەزارەت، بە پشتبەستن بە ئاکامەکانی پیادەکردنی سیستەمی دڵنیایی جۆریی، پرۆسەی هاندان جێبەجێ دەکات.

**پێنجەم**: ڕاپۆرتی ئەنجامەکانی پرۆسەی هەڵسەنگاندن لەناو دۆسیەی دامەزراوەکەدا هەڵدەگیرێت و وێنەیەکی بۆ بەڕێوەبەرایەتیی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن لە پارێزگا بەرزدەکرێتەوە.

## تەوەری هەشتەم
## دڵنیایی جۆریی لەکاتی دامەزراندنی دامەزراوەی پەروەردەییدا

**ماددەی (94):**

**یەکەم**: هیچ دامەزراوەیەکی پەروەردەیی نادامەزرێت و مۆڵەتی پێ نادرێت، ئەگەر پێداویستییە خوازراوەکان و ڕێکارەکانی دڵنیایی جۆریی و ڕێبەری دڵنیایی جۆریی، نەبێت.

**دووەم**: هەموو دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان، هەر چوار ساڵ

جارێک، داوای باوەڕپێدان لە وەزارەت دەکەن، کە وەک سەلماندنی ئاستی وانەوتنەوە ئەژماردەکرێت، وەزارەت لەو ڕووەوە پشت بەو هەڵسەنگاندنەی دامەزراوەکە دەبەستێت کە لە چوار ساڵی پێشتردا بەدەستیهێناوە.

## تەوەری نۆیەم
## ئامانجی سەرپەرشتیکردن و هەڵسەنگاندن

**ماددەی (95):**

**یەکەم**: ئامانجی سەرپەرشتیکردن و هەڵسەنگاندن، گەیشتنە بە ئامانجە پەروەردەیی و فێرکارییەکان و باشترکردنی پرۆسەی پەروەردەیی و فێرکردن و بنیاتنانی تواناکانە لە دامەزراوەکاندا.

**دووەم**: دەبێت پەرەپێدانی شێوازەکانی پێوانە و هەڵسەنگاندنی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە ڕووە جیاوازەکانیەوە، بەپێی بنەما و پێوەری بابەتی بێت، کە مەبەست لێی پەرەپێدانی بوارەکانی پێشخستنە لای قوتابی و خوێندکار و فەرمانبەرانی دامەزراوەکە و بۆ باشترکردنی پرۆگرامەکانی خوێندن و ناوەڕۆکەکانیان و شێوازەکانی وانەوتنەوە و تاقیکردنەوەکان و بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی توانای مامۆستاکانە.

### لقی یەکەم
### ئەرکەکانی سەرپەرشتیکردن

**ماددەی (96):**

**یەکەم**: ڕێنوێنی، بەدواداچوون، هەڵسەنگاندن، پشتیوانیکردن و پشکنینی کاری دامەزراوەکان و مامۆستایان و فەرمانبەران لە ڕووە

جیاوازەکانەوە.

**دووەم**: پشـتگیریکردنی دامـەزراوە پەروەردەیـی و فێرکارییـەکان بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستەکانیان.

**سێیەم**: داهێنانی ڕێکاری بابەتیانە بۆ دڵنیایی جۆریی.

**چـوارەم**: ئامادەکردنـی ڕاپۆرتـی سـاڵانە سـەبارەت بـە بـاش بەڕێوەچوونی پرۆسـەی پەروەردە و فێرکردن، پلان و پێشـنیازەکانی بەڕێوەبەرایەتیـی گشـتیی دڵنیایـی جۆریـی و سـەرپەرشـتیکردن، سـەرپەرشـتیاری و چۆنیەتـی گەشـەکردنی پرۆسـەی پەروەردەیـی و فێرکاریـی و چالاکییـەکان، کاروبـاری دارایـی و کارەکانـی دیکـەی بەڕێوەبەرایەتییەکە.

## لقی دووەم

### ئەرکەکانی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی

### ماددەی (97)

**یەکەم**: ڕێنوێنی، بـــەدواداچوون، هەڵسەنگاندن، پشتیوانیکردن و سـەرپەرشـتیکردنی کارەکانـی دامـەزراوەکان، بـۆ دڵنیابـوون لـە ئاستی پەروەردەیی و فێرکردن و ڕێگەکانی کارکردنیان، بەمەبەستی گەشەپێدانی کاری دامەزراوەکان و پرۆسەی پەروەردە و فێرکاریی بە شێوەیەکی گشتی و پشتگیریکردنی دامەزراوەکان لە کارەکانیاندا.

**دووەم**: دڵنیابوون لە هەبوونی ڕێکاری تۆکمە بۆ دڵنیایی جۆریی لە دامەزراوەکاندا.

**سـێیەم**: هەڵسـەنگاندنی کاری کارگێڕیـی دامـەزراوەکان بەپێـی پێوەرەکانی وەزارەت.

**چـوارەم**: هەڵسـەنگاندنی پابەندبوونـی مامۆسـتایان لـە کاتـی وانەوتنـەوەدا بەپێـی پێوەرەکانـی وەزارەت و هەڵسـەنگاندنی مامۆستایان بەپێی پێوەری زانستی تایبەت.

**پێنجـەم**: هەڵسـەنگاندن بـۆ ئاسـتی پابەندبوونـی دامـەزراوەکان

بـە یاسـا و ڕێنماییـەکان، ئاسـتی تۆمارکردنـی دەسـکەوتەکانی دامەزراوەکە و تۆمارکردنی هەر پێشێلکارییەک، کە لە دامەزراوەکەدا ڕوویدابێت.

**شەشـەم**: هەڵسـەنگاندن بۆ ئاسـتی پابەبەندبوونی دامـەزراوە بە پروگرامەکانـی خوێندن و ڕادەی پشـتیوانیکردن و هاندانی کارامەیی سەرکردایەتی لای قوتابیان و خوێندکاران و مامۆستایان.

**حەوتـەم**: دڵنیابوون لە پابەندبوونی مامۆسـتایان بـە ئامادەکردنی هەگبەکانیان و کۆکردنەوەی بەڵگەی دڵنیایی جۆریی و زانستخوازیی بەردەوام.

**هەشتەم**: هەڵسەنگاندنی ئاستی پەروەردەیی و فێرکردنی قوتابیان و خوێندکاران و ڕێژەی دەرچوونیان.

**نۆیەم**: هەڵسەنگاندنی ژینگەی خوێندن.

**دەیـەم**: هەڵسـەنگاندنی ئاسـتی چالاکـی ئامادەیـی پیشـەیی و پەیمانگـە پەروەردەییـە پیشـەییەکان لـە ڕووی هەماهەنگیکردنیان لەگەڵ بازاڕی کاردا.

**یازدەیەم**: هەڵسەنگاندنی پلانی خوێندنی دامەزراوەکان و چۆنیەتی جێبەجێکردنـی و ئەنجامەکانیـان، بەپێی چەند فۆرمێکی گشـتگیر و پێوەری باوەڕپێکراو.

**دوازدەیەم**: هەڵسـەنگاندنی هەر بوارێکی دیکە کە سەرپەرشتیار لە چوارچێـوەی داواکاریەکانـی بەڕێوەبەرایەتی گشـتی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشـتیکردن، بـە گرنگـی دابنێت لە ڕووی سـوودگەیاندن بە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن.

**سێزدەیەم**: کارکردن لە پێناو سوودوەرگرتن لە گرنگی توێژینەوەکانی نـاوەوە و دەرەوەی هەرێم سـەبارەت بە گەشـەپێدانی سیسـتەمی پەروەردەیی و فێرکردن.

**چواردەیـەم**: وەرگرتنـی سـکاڵای قوتابیـان و خوێنـدکاران و کەسوکاریان لە بارەی بەڕێوەچوونی پرۆسەی پەروەردە و فێرکاری لە

دامەزراوەکان و لێکۆڵینەوە لێیان، بێ ئاشـکراکردنی ناوی سکاڵاکار و بڕیاردانی گونجاو لە بارەیانەوە لە ماوەیەکدا، کە لە (1) یەک مانگ تێپەڕ نەکات.

## لقی سێیەم

## ڕێکاری ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرپەرشتیار لە کاتی سەردانی دامەزراوەکاندا

**ماددەی (98)**

**یەکەم**: ئامادەکاریی بۆ سـەردانی دامـەزراوەکان بەپێی ڕێکارەکان و پێداویستیەکانی سیستمی دڵنیایی جۆریی.

**دووەم**: بەدواداچـوون و سەرپەرشـتیکردنی کاری دامـەزراوەکان، دڵنیابـوون لـە بوونـی ڕێکاریـی فەراهەمکردنـی دڵنیایـی جۆریـی و بەدواداچوونیان.

**سـێیەم**: شـیکردنەوەی ئەنجامـی سـەردانیکردنەکان و نووسـینی ڕاپۆرتی کۆتایی هەڵسەنگاندن.

**چوارەم**: ڕاگەیاندنی ڕاپۆرتی کۆتایی و ناردنی وێنەیەکی بۆ دامەزراوە پەیوەندیدارەکە.

## لقی چوارەم

## دامەزراندنی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی

**ماددەی (99):**

**یەکەم**: مەرجەکانی دامەزارندنی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی:

1 - بڕوانامەی بەرایی زانکۆی هەبێت و ناونیشانی مامۆستا بێت.

2 - ئەزموونـی لە بواری پەروەردە و فێرکردن لە (10) دە سـاڵ کەمتر نەبێـت، لـەو ماوەیـە لانیکـەم (5) پێنج سـاڵ کاری وانـە وتنەوەی کردبێت.

3 - بەشـداری لـە خولـی شـیاندنی سەرپەرشـتاریی کردبێـت، کـە وەزارەت سـاڵانە بە هاوکاری لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتییە گشـتییەکانی پەروەردە، ئەنجامیدەدات.
4 - بـە تاوانـی ئابڕووبـەر حوکـم نەدرابێـت و سـزای کارگێڕیـی (سەرزەنشت) و زیاتری بەسەردا نەسەپێنرابێت.

**دووەم**: ڕێکارەکانی دامەزراندنی سەرپەرشتیاران:-
1 - سەرپەرشـتیار، لەلایـەن لیژنەیەکی پسـپۆڕ لـە بەڕێوەبەرایەتیی گشـتیی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن و بەپێی تاقیکردنەوەی بابەتیانـە دەپاڵێورێـت و فەرمانـی دانانیـان لەلایـەن وەزیـرەوە بـۆ دەردەچێت.
2 - لە کاتی پاڵاوتن، لە پێشـینەیی بۆ ئەو مامۆستایەیە، کە خاوەن بڕوانامەی بەرزتر و لێهاتوویی زیاترە.
3 - هەر کەسـێک کە داواکاریی بۆ کاری سەرپەرشتیاری پەروەردەیی پێشکەش کردبێت و کارەکەی پێ نەدرێت بەپێی یاسای ئەنجومەنی شـورای بەرکار لـە هەرێم مافی دادخـوازی و تانەلێدانی لـە بڕیارەکە هەیە.

## بەشی یەکەم
## ئامانج، جۆرەکان و دامەزراندن

---

## تەوەری یەکەم
## ئامانج

**ماددەی (100):**

ئامانج لە مۆڵەتپێدانی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان ئەمانەن:-

**یەکەم**: ڕەخساندنی بواری زیاتر بۆ پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن بە بەراورد بە تواناکانی حکومەت.

**دووەم**: دابینکردن و ئامادەکردنی پێداویستییە جۆراوجۆرەکان بۆ نوێکردنەوەی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە ڕێگەی پرۆگرام و ڕێکارە هاوچەرخەکان.

**سێیەم**: هاندانی پرۆسەی وەبەرهێنانی نیشتمانی و بیانی لە بوارەکانی پەروەردە و فێرکردن لە چوارچێوەی سیستمێکی هاوچەرخدا.

**چوارەم**: ڕەخساندنی هەل لە بواری پەروەردە و فێرکردن بۆ ڕەوەند و کەسانی بیانی و ئەوانەی گەڕاونەتەوە هەرێم.

**پێنجەم**: سوودوەرگرتن لە ئەزموون و پێوەرە زانستییە سەرکەوتووەکان، بەمەبەستی دەوڵەمەندکردنی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن و بەرزکردنەوەی ئاست و بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو.

## تەوەری دووەم
## جۆرەكانی دامەزراوە پەروەردەییە ناحكومییەكان

**ماددەی (101):**

**یەكەم**: دامەزراوە پەروەردەییە ناحكومییەكان چوار جۆرن:-

1 - دامەزراوەی پەروەردەیی ناحكومی خۆماڵی، كە پرۆگرامی حكومی یان پروگرامێكی تایبەت بە خۆیان كە لە وەزارەت ڕێگەپێدراوە، پیادە دەكەن.

2 - دامەزراوەی پەروەردەیی ناحكومی قازانج نەویست، كە پرۆگرامی حكومی یان پروگرامێكی تایبەت بە خۆیان كە لە وەزارەت ڕێگەپێدراوە، پیادە دەكەن.

3 - دامەزراوەی پەروەردەیی ناحكومی نێودەوڵەتی، كە بریتین لەو دامەزراوانەی كە:-

أ- پرۆگرامێكی خوێندنی ناوەندێكی متمانەدەری نێودەوڵەتی فێركردنی جیهانی پێشكەوتووی تێدا پیادە دەكرێت.

ب- سیستەمێكی ئەزموونەكانی ناوەندێكی پەروەردەیی نێودەوڵەتی متمانەداری باوەڕپێكراویان تێدا پیادە دەكرێت.

ج- سیستەمێكی سەرپەرشتیاری یان هەڵسەنگاندنی ناوەندێكی پەروەردەیی نێودەوڵەتی باوەڕپێكراویان، هەبێت.

4 - دامەزراوە پەروەردەییە ناحكومیە بیانییەكان، كە پرۆگرامی خوێندن، سیستەمی تاقیكردنەوەكان، جۆری بڕوانامە و هەڵسەنگاندنی وڵاتێكی دیاریكراو پیادە دەكەن، بە ڕەچاوكردنی بنەما گشتییەكانی خوێندن لە هەرێم، وەك ئەوەی لە یاسا بەركارەكاندا، هاتووە.

**دووەم**: گشت دامەزراوە ناحكومییەكان پابەندن بە پیادەكردنی سیستەمی دڵنیایی جۆریی و، نابێت ئامانجەكانیان لەگەڵ ئامانج و فەلسەفەی ئەم یاسایەدا، ناكۆك بێت.

## تەوەری سێیەم
## دامەزراندنی دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی

**ماددەی (102):**

هەر کەسێک عێراقی بێت یان بیانی، سروشتی بێت یان مەعنەوی و شیاوی یاسایی هەبێت، ئەگەر مەرجەکانی بەخشینی مۆڵەتی تێدا بێت، مافی دامەزراندنی دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی هەیە.

### لقی یەکەم
### مەرجەکانی بەخشینی مۆڵەتی دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی

**ماددەی (103):**

**یەکەم**: دەبێت پرۆژەی بونیادنانی دامەزراوەکە ناکۆک نەبێت لەگەڵ بەها نیشتمانی و بنەما گشتی و فەلسەفەییەکانی پەروەردە و فێرکردن لە هەرێم.

**دووەم**: نابێت داواکاری مۆڵەت ڕێکخراوێکی سیاسی یان ئایینی بێت.

**سێیەم**: پێویستە داواکاری مۆڵەت بە تاوانی ئابڕوبەر حوکم نەدرابێت.

**چوارەم**: پێویستە داواکاری مۆڵەت قەرز و باجی لەسەر نەبێت و بەڵگەنامەی ئەستۆپاکی قەرز و باج لەگەڵ داواکاریی مۆڵەتدا پێشکەش بکات.

**پێنجەم**: پێویستە داواکاری مۆڵەت تەلاری تایبەت بە خۆی، یان گرێبەستی سەرەتایی بۆ بەکرێگرتنی تەلارێکی گونجاو، یان زەویەکی گونجاوی بۆ دروستکردنی تەلارێکی پەروەردەیی و فێرکاری هەبێت، مەرج و ڕێکارەکانیشی بەپێی ڕێنماییەک دەبێت کە وەزیر دەریدەکات، بێ ئەوەی مەرجە بیناسازییەکانی لەو مەرجانە

توندتربن کە بۆ دروستکردنی تەلاری دامەزراوەی پەروەردەیی حکومی دانراون.

**شەشەم**:

1 - پێویستە داواکاری مۆڵەت ناوێکی جیاکەرەوە بۆ دامەزراوەکەی دیار بکات، بە جۆریک کە ناوەکە، یان ناوە لێکدراوەکە، بە تەواویی هەمان ناو نەبێت کە دامەزراوەیەکی پەروەردەیی دیکە، لە هەمان بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە هەیەتی، نابێت ناوەکە لەگەڵ پەیامی پەروەردە ناکۆک بێت.

2 - ئەگەر داواکاری مۆڵەت دامەزراوەی پەروەردەیی دیکەی هەبێت، مافی هەڵبژاردنی هەمان ناوی دامەزراوەکەی پێشتری بۆ دامەزراوە نوێکەی هەیە، بەڵام بە زیادکردنی وشەیەک، یان ناوێکی دیکە.

**حەوتەم**: نابێت داواکاری مۆڵەت لە (6) شەش ساڵی پێشتر دەستبەرداری خاوەندارێتی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی بوو بێت بۆ کەسێکی دیکە.

**هەشتەم**: دەبێت داواکاری مۆڵەت گشت مەرجەکانی پێدانی مۆڵەتی تێدابێت.

## لقی دووەم

## پێداویستییەکان لە کاتی پێشکەشکردنی داواکریی مۆڵەتدا

## ماددەی (104):

**یەکەم**: دەبێت داواکاریی مۆڵەت ئەم زانیارییانەی خوارەوە لە خۆبگرێت:-

1 - سوودە پەروەردەیی و فێرکاریی و کۆمەڵایەتییەکانی دروستکردنی دامەزراوەکە.

2 - سەرچاوە داراییەکان و لایەنی پشتیوانکار.

3 - بڕی کرێی خوێندنی ساڵانە و ژمارەی قیستەکان کە دەبێت بە

دراوی نیشتمانی بێت.
4 - مەرجەکانی وەرگرتنی قوتابیان و خوێندکاران و مەرجەکانی گواستنەوەیان.
5 - پرۆگرامەکانی خوێندن، بەجۆرێک کە لەگەڵ ئامانج و فەلسەفەی ئەم یاسایەدا ناکۆک نەبێت.
6 - بنەماکانی دەرچوون و دەرنەچوون و سیستەمی تاقیکردنەوەکان و ساڵنامەی خوێندن.
7 - بنەماکانی سەرپەرشتیکردن و هەڵسەنگاندن.
8 - زمانی خوێندن.
9 - بازنە و قۆناغ و ژمارەی ساڵەکانی خوێندن.
10 - کارامەیی داواکراو لە کارمەندەکاندا.
11 - چۆنیەتی دابینکردنی چاودێریی تەندروستی و چالاکییە جۆراوجۆرەکان.
12 - پەیڕەوی ناوخۆی پێشنیازکراو بۆ کارگێڕیی دامەزراوەکە.
13 - ڕێکارەکانی بەدەستهێنانی دڵنیایی جۆریی.
14 - شوێنی دامەزراوەکە و نەخشەی بیناسازیی.
15 - پێشکەشکردنی بەڵگەنامەی ئەستۆپاکی لە قەرز و باج.
16 - شێواز و میکانیزمی جێبەجێکردنی ئەرک و پابەندیی دامەزراوەکە بۆ قوتابیان و خوێندکارانی خاوەن پێداویستی تایبەت.
**دووەم**: ئەگەر داواکە سەبارەت بە دامەزراندنی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی نێودەوڵەتی، یان بیانی بێت، ئەوکاتە پێویستە نوسراوێکی فەرمی سەبارەت بە وەدەستهێنانی بەڵگەنامەی کاندیدبوون بۆ متمانەبەخشین (ئەکریدیتەیشن) لەلایەن ناوەندی سەرەکیی دامەزراوە نێودەوڵەتییەکە، یان دەوڵەتە پەیوەندیدارەکە، لەگەڵ داواکاریەکە هاوپێچ بکرێت.

## لقی سێیەم
## پێشکەشکردنی داواکاریی مۆڵەت و ڕێکارەکانی وەزارەت بۆ پێدانی

**ماددەی (105):**

**یەکەم:**

1 - پێشکەشکردنی داواکاریی مۆڵەت لەنێوان ڕۆژی یەکەمی مانگی تشرینی دووەم تا ڕۆژی یەکەمی مانگی ئازار دەبێت.

2 - پێشکەشکردنی داواکاریی مۆڵەت، دوای پێدانی ڕەسمی پێشکەشکردنی داواکاریی و هەبوونی گشت مەرجەکانی ماددەی (103) لە داواکاردا و دابینکردنی گشت پێداویستیەکانی ماددەی (104) دەکرێت.

3 - پێش بڕیاردان لە داواکە، وەزارەت مافی داواکردنی گۆڕینی داواکارییەکە و ئامادەکردنی هەر پێداویستییەکی لە داواکار هەیە، بە گۆڕینی نرخی ساڵانەی خوێندنی پێشنیارکراویشەوە.

4 - وەزارەت لە ماوەی (60) شەست ڕۆژ لە ڕێکەوتی پێشکەشکردنی داواکارییەکە بە گشت مەرج و پێداویستیەکانییەوە وەڵام دەداتەوە، ئەگەر لەو ماوەیەدا وەڵامی نەدایەوە، داواکارییەکە بە ڕەتکراوە ئەژمار دەکرێت.

**دووەم:**

1 - لە ئەگەری ڕەتکردنەوەی داواکارییەکە لەلایەن وەزارەتەوە، دەبێت ڕەتکردنەوەکە بە نوسراو و هۆدار بێت، لەو بارەدا ڕەسمەکانی پێشکەشکردنی مۆڵەت نادرێتەوە.

2 - داواکاری مۆڵەت مافی دادخوازی لە بڕیاری ڕەتکردنەوە، یان وەڵام نەدانەوەی لە ماوەی دیاریکراودا، لە ماوەی (30) سی ڕۆژ لە ڕێکەوتی پێڕاگەیاندنی بڕیارەکە، یان دوای تێپەربوونی (60) شەست ڕۆژەکە، هەیە.

**سێیەم**: لە ئەگەری پێنەدانی مۆڵەت، داواکار مافی هەیە دوای نەمانی هۆیەکانی پێنەدانی مۆڵەت و پێدانی ڕەسمی نوێ، جارێکی دیکە داوای مۆڵەت پێشکەش بە وەزارەت بکات.

**لقی چوارەم**

**پێدانی مۆڵەت و دەرئەنجامەکانی**

**ماددەی (106):**

**یەکەم** : تەنها پاش بڕیاری وەزیر بە پێدانی مۆڵەت و بەجێهێنانی ئەم ئەرکانەی خوارەوە، مۆڵەت کاری پێدەکرێت.

1 - پێدانی ڕەسمی دامەزراندن.

2 - دانانی بارمتە نامە، بە بڕێک کە وەزیر بە ڕێنمایی دیاریدەکات و بۆ ماوەی (3) سێ ساڵ دەبێت، ئەویش بۆ دڵنیابوون لە بەڕێوەبردنی کاری دامەزراوەکە بە شێوەیەکی باش و لە کاتی نوێکردنەوەی مۆڵەتدا، دامەزراوەکە پابەند دەکرێت بە نوێکردنەوەی دڵنیایی بانکی.

3 - پێشکەشکردنی هەر پێداویستییەکی دیکە کە وەزارەت بە پێویستی دەزانێت.

**دووەم**: پێدانی مۆڵەتی باخچە و قوتابخانە و خوێندنگە و پەیمانگە ناحکومییەکان بەپێی پێویست و پلانی وەزارەت و جۆری پسپۆرییەکەیان دەبێت.

**ماددەی (107):**

**یەکەم**: ڕێگە بە دەستبەکاربوونی هیچ دامەزراوەیەکی پەروەردەیی نادرێت و ناتوانێت قوتابی و خوێندکار وەربگرێت تا بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە مۆڵەت وەرنەگرێت.

**دووەم**:

1 - ئەو کەسەی مۆڵەتی دامەزراندنی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی

ناحکومـی وەردەگرێـت، دەبێـت لە مـاوەی (1) یەک سـاڵ لە ڕۆژی وەرگرتنی مۆڵەتەکە دامەزراوەکەی دەستبەکار بێت، تەنها یەکجار و بۆ ماوەی (1) یەک ساڵ ماوەکەی بۆ درێژ دەکرێتەوە.

2 - ئەگەر دروسـتکردنی تەلاری دامەزراوەکە بەپێی مەرجەکان، زیاتر لە دوو سـاڵی لـە ڕۆژی وەرگرتنـی مۆڵەت خایانـد، دەکرێت ماوەی یەک ساڵی تریش بدرێت بە خاوەن مۆڵەت بە مەرجێک ڕەسمەکان بدات.

3 - درێژکردنـەوەی ماوەکانـی هاتـوو لـە خاڵەکانـی (1، 2)ی ئـەم بڕگەیە، بە بڕیاری وەزیر و لەسـەر داوای خاوەن مۆڵەت و پێشـنیاری بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی ناحکومی دەبێت.

**سێیەم**:

1 - مۆڵـەتی دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومـی بـە باخچـە و قوتابخانـە و خوێندنگەیـەک نادرێت کـە لە چوارچێـوەی پڕۆژەیەکی وەبەرهێنانی بواری نیشـتەجێبووندا دروسـتکرابێت و بەشێک بێت لـەو خزمەتگوزارییـە گشـتییانەی کـە پێشـتر خـاوەن پڕۆژەکەی پێ پابەندکراوە.

2 - ئەگـەر لـە هەمـان کاتدا، لـە مۆڵـەتی پـڕۆژەی وەبەرهێنانەکەدا مـافی هـەردوو دامـەزراوەی پەروەردەیـی حکومـی و ناحکومـی پێدرابێت، ئەوا دەبێت یەکەمجار دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکە بونیاتبنێـت، بەپێچەوانـەوە، مۆڵـەت بـە دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییەکە نادرێت.

3 - هـەر پڕۆژەیەکـی وەبەرهێنانی هاتوو لە خاڵـی (1)ی ئەم بڕگەیە، ئەگـەر دوای چوونـە بـواری جێبەجێکردنـی ئـەم یاسـایە، پابەنـدی دروسـتکردنی دامـەزراوەی پەروەردەیـی حکومـی نەبووبێـت، بـە دروسـتکردنی دامەزراوەکـە پابەنـد دەکرێـت، تەنانـەت ئەگەر زەوی تەرخانکراویـش بـۆ بواریکـی دیکـە بەکارهاتبێت و ناچـار دەکرێت لە دەرەوەی پڕۆژەکە دامەزراوە پەروەردەییەکە دروست بکات.

4 - پـڕۆژەکانی وەبەرهێنان و کۆمپانیـاکانی خزمەتگوزاریی، پابەندن بە دابینکردنی خزمەتگوزارییە گشـتییەکان بۆ دامەزاروە پەروەردەییە حکومییـەکان، بـە هەمـان نرخـی دابینکـردنی خزمەتگوزارییەکـە لەلایەن کەرتی گشتییەوە.

## لقی پێنجەم

### نوێکردنەوەی مۆڵەت

**ماددەی (108):**

**یەکـەم**: دەبێـت داواکاریی نوێکردنـەوەی مۆڵەت، لانیکـەم بە (3) سـێ مانگ پێـش بەسـەرچوونی مۆڵەتی کارپێکراو، پێشـکەش بە وەزارەت بکرێت.

**دووەم**:

1 - نوێکردنەوەی مۆڵەت هەر (3) سێ ساڵ جارێک دەبێت.

2 - ڕێکارەکانـی نوێکردنـەوەی مۆڵـەت بـە ڕێنماییـەک کـە وەزیـر دەریـدەکات ڕێکدەخرێـت، بـە ڕەچاوکردنـی ئـەوەی کـە وەزارەت دەبێت لە ماوەی (30) سـی ڕۆژدا، لە ڕۆژی پێشکەشـکردنی داوای نوێکردنەوەی مۆڵەت بە گشـت پێداویسـتیەکانیەوە، بڕیار لەسـەر نوێکردنەوە، یان ڕەتکردنەوەی داواکە بدات.

3 - ئەگەر گشت مەرجەکانی نوێکردنەوەی مۆڵەت لە داواکارییەکەدا هەبوو، مۆڵەتەکە نوێ دەکرێتەوە.

4 - لـە کاتـی نوێکردنـەوەی مۆڵـەت، دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییەکان مافیان هەیە لە سەرهەمان کرێی ساڵانەی خوێندن کە پێش نوێکردنەوەی مۆڵەت هەیانبووە، بەردەوام بن.

5 - ئەگەر نوێکردنەوەکە سـەبارەت بـە دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتی یـان بیانـی بـوو، دەبێـت دامەزراوەکـە نـووسراوی متمانـە (ئەکریدیتەیشن)، نەک کاندیدبوون لە دامەزراوە نێودەوڵەتییەکە، یان دەوڵەتە بیانییەکە، هاوپێچ بکات.

## لقی شەشەم

## دەستبەرداربوون لە خاوەنداریەتی مۆڵەت و گواستنەوە

**ماددەی (109):**

**یەکـەم**: خاوەنـی مۆڵـەت، تەنهـا پـاش تێپەڕبوونی (4) چوار سـاڵ بەسـەر دامەزراندنـی دامەزراوەکـە بە شـێوەیەکی کرداریـی، مافی دەستبەرداربوونی خاوەنداریەتی مۆڵەتەکەی هەیە.

**دووەم**:

1 - خـاوەن مۆڵـەت ناتوانێـت بـێ ڕەزامەنـدی فەرمـی وەزارەت و هەبوونـی گشـت مەرجەکان لـەو کەسـەی داواکارە ببێتـە خاوەنی نوێ، دەستبەرداری مۆڵەتەکەی ببێت.

2 - لـە کاتـی هەبوونی گشـت مەرجـەکان لـە داواکاردا، وەزارەت لە ماوەیـەک کە لـە (60) شەسـت ڕۆژ لـە ڕێکەوتی پێشکەشـکردنی داواکارییەکـە بـە گشـت پێداویسـتیەکانیەوە تێپـەڕ نـەکات، داواکارییەکە پەسەند دەکات.

**سێیەم**: مۆڵەت نادرێت بە هیچ کەسێک، کە لە ماوەی (6) شەش سـاڵی پێشتر، دەسـتبەرداری خاوەنداریەتی مۆڵەتێک بووبێت، یان مۆڵەتەکەی هەڵوەشێنرابێتەوە.

**ماددەی (110):**

**یەکـەم**: لـە حاڵەتـی مردنـی خـاوەن مۆڵـەت، مۆڵەتەکـە بـۆ میراتگرەکەی دەگوازرێتەوە، بە مەرجێک گشـت مەرجەکانی پێدانی مۆڵەتی هاتوو لەم یاسایە، لە میراتگردا هەبێت.

**دووەم**: لە کاتی بوونی مەرجەکانی ئەم یاسایە لە میراتگردا، میراتگر یـان نوێنەرێکـی یاسـایی دەتوانێت کەسـێک کـە مەرجەکانـی تێدا بێـت بۆ بەڕێوەبردنـی دامەزراوەکە هەڵبژێرێـت، هەروەها دەتوانێت دامەزراوەکـە بفرۆشـێت، یان دەسـتبەرداری ببێت بۆ کەسـێک کە مەرجەکانی پێدانی مۆڵەتی تێدا بێت.

**سێیەم**: ئەگەر مەرجەکانی وەرگرتنی مۆڵەت لە میراتگر، یان نوێنەرە

یاسـاییەکەیدا بوونی نەبوو، ئـەوا دامەزراوەکە دەفرۆشرێتەوە، یان دەسـتبەرداری دەبێت بۆ کەسێک کە مەرجەکانی وەرگرتنی مۆڵەتی تێدا بێت.

**ماددەی (111):**

**یەکـەم**: دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی مافی گواسـتنەوەی بۆ تەلارێکی دیکە هەیە.

**دووەم**: مەرجەکانـی گواسـتنەوەی دامەزراوەکـە لـە تەلارێـک بـۆ تەلارێکی دیکە بە ڕێنمایی کە وەزیر دەریدەکات، ڕێکدەخرێت.

## تەوەری چوارەم
## هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەت

**ماددەی (112):**

لـە هـەر یـەک لـەم بارانـەی خـوارەوەدا، ئەرکـی وەزارەتە لـە ماوەی (60) شەسـت ڕۆژدا، مۆڵەتـی دامەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومی، هەڵوەشێنێتەوە:-

**یەکـەم**: کاتێـک دامەزراوەیـەک دەفرۆشرێـت، یـان خاوەنەکـەی دەستبەرداری دەبێت، بەبێ ڕەزامەندی فەرمی وەزارەت.

**دووەم**: کاتێک دامەزراوەیەک بەردەوام دەبێت لە داخسـتنی دەوام بـە ڕووی قوتابیـان و خوێندکارانـدا زیاتر لە (1) یـەک هەفتە و بەبێ هۆی ڕەوا و بەبێ گوێدانە هۆشداری فەرمی وەزارەت.

**سـێیەم**: کاتێـک دامەزراوەیـەک دەگوازرێتـەوە لـە تەلارێـک بـۆ تەلارێکی دیکە، بێ ڕەزامەندی فەرمی وەزارەت.

**چوارەم**: کاتێک خاوەنی مۆڵەت لە کاتی دیاریکراودا، داوا سـەبارەت بە نوێکردنەوەی مۆڵەت پێشـکەش بە وەزارەت ناکات، بێ گوێدانە هۆشـداری دووبارەی فەرمی وەزارەت سـەبارەت بە بەسـەرچوونی

مۆڵەتی کارپێکراو.

**پێنجەم**: کاتێک دامەزراوەیەک لەو کاتەی بەپێی بڕیاری مۆڵەت بۆی دیاریکراوە دەستبەکار نابێت، بەبێ بوونی پاساوێکی ڕەوا کە لەلایەن وەزارەتەوە پەسەند کرابێت.

**شەشەم**: کاتێک دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی نێودەوڵەتی یان بیانی، متمانەی (ئەکریدیتەیشن)ی ئەکادیمی لەدەست دەدات، لەو کاتەدا دامەزراوەکە دەکرێت بە دامەزراوەیەکی خۆماڵی.

**حەوتەم**: کاتێک سەلمێنرا کە بڕیاری پێدانی مۆڵەت لەسەر بنەمای بەڵگە و نووسراوێکی ساختە بێت.

**هەشتەم**: کاتێک خاوەن مۆڵەت، پاش ئاگادارکردنەوەی زیاتر لە جارێک لەلایەن وەزارەتەوە، بەڵگەنامەی ئەستۆپاکی پێشکەش نەکات.

**نۆیەم**: کاتێک دامەزراوەکە پابەند نابێت بە ئەرک و پابەندییە یاسایی و کارگێڕییەکانی، سەرەڕای هۆشداریی زیاتر لە جارێکی وەزارەت.

تەوەری پێنجەم

ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتی دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی

**ماددەی (113):**

**یەکەم**: بە مەبەستی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە سەرپێچییەکانی دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی، وەزیر لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە بە سەرۆکایەتی بەڕێوەبەرێکی گشتی و ئەندامیەتی چەند فەرمانبەرێکی دیکە، کە یەکێکیان یاسایی دەبێت، پێکدەهێنێت، لیژنەکە ڕاسپاردەکانی پێشکەش بە وەزیر دەکات.

**دووەم** : ئەرک و ڕێکارەکانی کاری لیژنەکە بە ڕێنماییەک کە وەزیر دەریدەکات، ڕێکدەخرێن.

**ماددەی (114):**

**یەکەم**:

1 - لـە کاتـی سـەلماندنی یەکێک لـە بارەکانـی مـاددەی (112)ی ئـەم یاسـایە، وەزارەت پێـش دەرکردنی بڕیـاری هەڵوەشـاندنەوەی مۆڵەت، مافی سـەپاندنی پێبژاردنێکی هەیە لە سـە¬ر دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی کە لە (10.000.000) دە ملیۆن دینار کەمتر نەبێت و لە (150.000.000) سەد و پەنجا ملیۆن دینار زیاتر نەبێت.

2 - وەزارەت مافـی دەستبەسـەرداگرتنی بـڕی دڵنیایـی بانکـی بـە شێوەیەکی کاتی هەیە.

**دووەم**: لـە مـاوەی (30) سـی ڕۆژ لـە بڕیـاری وەزیـر بە سـەپاندنی سـزای پێبژاردن، یان هەڵوەشـاندنەوەی مۆڵـەت، خاوەنی مۆڵەت دەتوانێـت دادخـوازی و تانە لە بڕیارەکـە بدات، بەپێـی حوکمەکانی یاسای ئەنجومەنی شورای بەرکار لە هەرێم.

**ماددەی (115):**

**یەکـەم**: لە ئەگـەری دەرکردنی بڕیـاری هەڵوەشـاندنەوەی مۆڵەت، خوێندن لە دامەزراوەکە تا کۆتایی سـاڵی خوێندن بەردەوام دەبێت، لـە ڕێگـەی بەڕێوەبردنێکـی هاوبەشـەوە لـە نێـوان دامەزراوەکـە و وەزارەت و گشـت تێچووەکانـی بەڕێوەبردنە هاوبەشـەکە، لەسـەر خاوەنی دامەزراوەکە دەبێت.

**دووەم**: بـە هەماهەنگـی لەگەڵ خاوەنی ئـەو دامەزراوەیەی بڕیاری هەڵوەشـاندنەوەی مۆڵەتەکـەی دراوە، وەزارەت دەتوانێـت دوای تەواوبوونـی سـاڵی خوێنـدن، بەرژەوەندی قوتابیـان و خوێندکاران و بەخێوکارانیـان، بـۆ دامەزراوەیەکـی پەروەردەیـی حکومـی، یـان ناحکومی دیکەیان بگوازێتەوە.

## تەوەری شەشەم
## حوکمە هاوبەشەکان

**ماددەی (116):**

خاوەنی دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی بەجێهێنانی پابەندییەکان لە ئەستۆدەگرێت و بەرپرسە لە فەراهەمکردنی مافەکانی کارمەندانی دیکەی دامەزراوەکە.

ماددەی (117):

**یەکەم**: هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی مافی کردنەوەی چێشتخانە و فرۆشگای لە دامەزراوەکە هەیە، بەپێی مەرجە تەندروستییەکان.

**دووەم**: دەبێت نرخی خواردن و شتومەکی خواردنگە و فرۆشگا گونجاو بێت، ئەنجومەنی وەزارەت مافی کەمکردنەوەی نرخەکانی هەیە ئەگەر لەچاو نرخی بازاڕ و هاوشێوەکانیان بەرزبوون.

**ماددەی (118):**

**یەکەم**: دەکرێت تەلاری دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان موڵک یان کرێ بن.

**دووەم**: ئەگەر تەلاری دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی لە (3) سێ نهۆم زیاتربوو، کە هەرسێکیان پۆلی تیدابێت، ئەو کاتە پێویستە ڕەزامەندیی فەرمی وەزارەت وەربگیرێت، ئەو هەلومەرجە تایبەتانە ڕوونبکرێنەوە، کە وایانکردووە تەلارەکە لە (3) سێ نهۆم زیاتر بێت، پاش ئەوە وەزارەت بڕیاری خۆی دەدات.

**سێیەم**: ئەو تەلارانەی دوای دەرچوونی ئەم یاسایە بۆ دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی دروست دەکرێن، دەبێت ڕووبەری پۆلەکانیان لە (35) سی و پێنج مەتر دووجا کەمتر نەبێت.

**چوارەم**: دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان، مافی خۆیانە تەلارەکانیان بۆ (2) دوو دەوامی یەک لە دوای یەک بەکاربهێنن .

**پێنجـەم**: نابێت ئەو مەرجە بیناسـازیانەی لە دامـەزراوە پەروەردەییە ناحکومییـەکان داوا دەکرێـن لە کاتـی دروسـتکردنی تەلارەکانیاندا، لـەو مەرجانـە توندتر بن کە لـە دامەزراوە پەروەردەییـە حکومییەکان داوا دەکرێن.

**شەشـەم**: تـەلاری ئـەو دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییانـەی پێش دەرچوونی ئەم یاسـایە دروسـتکراون، بەپێی یاسـا و ڕێنمایی و مۆڵەتـی کارپێکـراوی کاتـی دروسـتکردنیان مامەڵەیـان لەگـەڵ دەکرێت.

**حەوتـەم**: خاوەنـی دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومـی، مافـی هەبوونی نوسینگەی خۆی لە تەلاری دامەزراوەکەدا هەیە.

**هەشـتەم**: ژێرزەمین بە نهـۆم هەژمار ناکرێت، نابێـت هیچ پۆلێکی وانەوتنـەوە لـە ژێرزەمیـن هەبێـت، بەڵکـو دەکرێـت بـۆ هۆڵـی کۆبوونـەوە و هۆڵـی تاقیکردنـەوە و تاقیگـە و کافیتێریـا و کاری خزمەتگوزاریی بەکاربهێندرێت.

## بەشی دووەم
## پڕۆگرامەکانی خوێندن، سیستەمی وەرگرتن، تاقیکردنەوەکان و بڕوانامەکان لە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان

---

## تەوەری یەکەم
## پڕۆگرام و کتێبەکان و بابەتەکانی خوێندن

### لقی یەکەم

**پڕۆگرامی خوێندن**

**ماددەی (119):**

هەر دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی، دەبێت بە یەکێك لەم چوار جۆرە پرۆگرامەی خوێندن پابەند بێت:-

**یەکەم**: پرۆگرامەکانی خوێندنی وەزارەت، ئەگەر دامەزراوەکە دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی خۆماڵی بێت.

**دووەم**: پروگرامێکی تایبەت، ئەگەر دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی، پێشوەختە و بەفەرمی، ڕەزامەندی بۆ پڕۆگرامەکەی لە وەزارەت وەرگرتبێت.

**سێیەم**: پرۆگرامی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی نێودەوڵەتی دانپێدانراو، کە لەلایەن بنکەی سەرەکیی دامەزراوە نێودەوڵەتییەکە پەسەندکرابێت و لەلایەن وەزارەتیشەوە مۆڵەتی پێدرابێت .

**چوارەم**: پرۆگرامی دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی بیانی، کە تایبەت بێت بە ڕەوەندە بیانییەکان و لەلایەن دەوڵەتی پەیوەندیدار و وەزارەتەوە پەسەند کرابێت.

## لقی دووەم

### بابەتەکانی خوێندن

**ماددەی (120):**

**یەکەم**: بابەتەکانی خوێندن لە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان بەپێی پرۆگرامی خوێندنی دامەزراوەکە دەبێت، کە پێشتر لە وەزارەت ڕەزامەندی بۆ وەرگیراوە.

**دووەم**: هەر دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی، دوای ئاگادارکردنەوەی وەزارەت، مافی زیادکردنی بابەتی خوێندنی بۆ پرۆگرامەکانی حکومی هەیە، بەو مەرجەی کاریگەری لەسەر بابەتەکانی خوێندن نەبێت و لەگەڵ بنەما گشتییەکان و فەلسەفەی ئەم یاسایە ناکۆک نەبێت.

## لقی سێیەم

### کتێبەکانی خوێندن

**ماددەی (121):**

**یەکەم**: ئەو دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییە خۆماڵییەی، کە پرۆگرامی وەزارەت پیادە دەکات، هەمان کتێبی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان بەکاردێنێت، مافی بەکارهێنانی کتێبی دیکەی هەیە، بە مەرجێک پێشوەختە ڕەزامەندی وەزارەتی بۆ وەرگرتبێت.

**دووەم**: ئەو دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییە خۆماڵیانەی پرۆگرامی تایبەت بە خۆیان دەخوێنن، پاش ڕەزامەندی وەزارەت، مافی هەبوونی کتێبی تایبەت بە خۆیان هەیە.

**سێیەم**: دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییە نێودەوڵەتی و بیانییەکان، کتێبی تایبەت بە خۆیان دەخوێنن، بەڵام دەبێت ڕەزامەندی فەرمی وەزارەتی بۆ وەربگرن.

**چوارەم**: لە گشت دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان، دەبێت بابەتی زمانی کوردی بە پێی پرۆگرامی وەزارەت بخوێندرێت.

## لقی چوارەم

### زمانی خوێندن

**ماددەی (122):**

**یەکەم**: دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی، بەهەمان ستافی بەڕێوەبردن، دەتوانێت خوێندن بە یەک یان زیاتر لە زمانەکانی عەرەبی، تورکمانی، سریانی، ئەرمەنی، ئینگلیزی، یان هەر زمانێکی دیکەی جیهانی باوەڕپێکراو بکات، بە مەرجێک بابەتی زمانی کوردی و زمانی عەرەبی بەپێی سیستمی وەزارەت بخوێندرێت.

**دووەم**: ڕەوەندی بیانی و پەنابەرەکان دەتوانن لە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان بە زمانی خۆیان بخوێنن، بە مەرجێک بابەتەکانی زمانی کوردی و زمانی عەرەبی بەپێی سیستەمی وەزارەت تێیاندا بخوێندرێت.

## تەوەری دووەم
## سیستمی وەرگرتن

**ماددەی (123):**

**یەکەم**: بنەمای سەرەکی وەرگرتنی قوتابی و خوێندکار، بەپێی ئەو مەرجانەی وەرگرتن دەبێت کە پێشتر لەلایەن دامەزراوەکە لەکاتی داواکردنی مۆڵەتی دامەزراندن پێشکەش بە وەزارەت کراوە و مۆڵەتی لەسەر وەرگیراوە، بە ڕەچاوکردنی حوکمی بڕگەکانی خوارەوەی ئەم ماددەیە.

**دووەم:**

1 - لە باخچەی منداڵانی ناحکومی، ئەو منداڵانە وەردەگیرێن کە لە ڕۆژی تۆمارکردنیان یان لە (31) کانونی یەکەمی ئەو ساڵە، تەمەنی (4) چوار یان (5) پێنج ساڵ تەواو دەکەن.
2 - هیچ منداڵێک لە قوتابخانەی بنەڕەتی ناحکومی وەرناگیرێت ئەگەر لە (31) کانونی یەکەمی ئەو ساڵە تەمەنی نەبووبێتە (6) شەش ساڵ.
3 - نابێت تەمەنی قوتابی لە قوتابخانەی بنەڕەتی ناحکومی لە (19) نۆزدە ساڵ زیاتر بێت.
4 - نابێت تەمەنی خوێندکاری ئامادەیی ناحکومی لە (28) بیست و هەشت ساڵ زیاتر بێت.
**سێیەم**: ئەو قوتابی و خوێندکارانەی لە دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی لە پۆلێکی دیاریکراودا دەخوێنن، جێگایان لە پۆلێکی بەرزتری هەمان دامەزراوە بۆ ساڵی خوێندنی دواتر دابینکراو دەبێت، بە مەرجێک دامەزراوەکە ئەو پۆلەی هەبێت و قوتابییەکە یان خوێندکارەکە دەرچووبێت و ئامادەبێت کرێی ساڵانەی خوێندن بدات.
**چوارەم**: دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان بۆیان نییە قوتابی و خوێندکار لەبەر هۆی ناپەروەردەیی، یان ئەوانەی خاوەن پێداویستیی تایبەتن وەرنەگرن، تەنها لەو بارەدا نەبێت کە قوتابی و خوێندکار پێویستی بە پۆلی تایبەت هەبێت، یان وەرگرتنی ببێتە هۆی خەرجی زیاتر لەسەر دامەزراوەکە.
**پێنجەم**:
1 - ئەرکی هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومییە، ساڵانە (5) پێنج کورسی بە خۆڕایی بۆ کوڕ و کچی شەهیدان و هاوسەرەکانیان تەرخان بکەن، بەو مەرجەی ئەو ژمارە داواکاریە هەبێت و داواکار مەرجەکانی هاتوو لەم یاسایەی تێدابێت.
2 - ئەرکی هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومییە، ساڵانە

(5) پێنج کورسـی بە خۆڕایی بۆ کوڕ وکچ و هاوسـەری ئەنفالکراوان و جینۆسـایدکراوان و کەمئەندامانـی سـەنگەر، یان کـوڕ و کچیان، تەرخـان بکـەن، بە مەرجێـک ئەو ژمـارە داواکاریـە هەبێـت و داواکار مەرجەکانی هاتوو لەم یاسایەی تێدابێت.

**شەشـەم** : دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان مافـی ئەوەیان هەیە کە بە ڕێژەی (10 %) دە لە سـەدی کورسـیەکانی هەر پۆلێک، بە پێی ڕێکاری دامەزراوەکە قوتابی و خوێندکار وەربگرن.

**حەوتـەم**: پێویسـتە دامـەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان سـاڵانە و پێـش کۆتایـی مانگی تشرینی یەکەم، لیسـتێک بە نـاو، تەمەن، پۆلەکانـی قوتابیـان و خوێنـدکاران، بـۆ بەڕێوەبەرایەتی پـەروەردەی پەیوەندیدار، بەمەبەستی ئاگادارکردنەوە، بنێرن.

**هەشـتەم**: هیـچ دامەزراوەیەکـی پەروەردەیـی ناحکومـی، نابێـت قوتابـی یـان خوێنـدکاری دامەزراوەیەکـی پەروەردەیـی ناحکومـی دیکە وەربگرێت و ڕەزامەندی لەسـەر گواسـتنەوە و بەشداریکردنی لـە خوێنـدن بـدات، ئەگـەر خوازیارەکـە پێشـوەختە بەڵگەنامـەی گواستنەوەی لە دامەزراوەی دووەمەوە نەهێنابێت.

**نۆیەم**: دامـەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان مافیان هەیە قوتابی و خوێندکار لەسەر بنەمای تاقیکردنەوە و نمرە وەربگرن.

## تەوەری سێیەم
## تاقیکردنەوە، نمرە و بڕوانامەکان

### لقی یەکەم

**تاقیکردنەوە و نمرەکان**

**ماددەی (124):**

**یەکەم**: کات و شێوەی بەڕێوەچوونی تاقیکردنەوەکان، دانانی نمرە لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان، بەسەر هەموو ئەو دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییانەدا پیادە دەکرێت کە پرۆگرامی حکوومی دەخوێنن، جگە لەو دامەزراوانەی پێشوەختە مۆڵەتیان لە وەزارەت وەرگرتووە بۆ پیادەکردنی سیستەمێک کە بەشێک لە وردەکارییەکانی جیاوازە لە سیستەمی حکومی.

**دووەم**: ئەرکی هەموو دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییە نێودەوڵەتی و بیانییەکانە، کات و شێوەی تاقیکردنەوە و نمرەدانانی تایبەت بەخۆیان هەبێت و پێشتر لەلایەن وەزارەتەوە پەسەند کرابێت.

**سێیەم**: بەمەبەستی وەرگرتن لە زانکۆ و پەیمانگەکانی هەرێم، وەزارەت لە ڕێگەی ڕێکاری تایبەتەوە بڕیار لە شێوازی هەژمارکردنی نمرەکانی قوتابیانی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییە نێودەوڵەتی و بیانییەکان و ئاستەکانیان دەدات.

**چوارەم**: پاش وردبینی، دامەزراوەکان وێنەیەکی ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی پۆلەکان بۆ یەکەی تاقیکردنەوەکان و بەشی ئەرشیف لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە و بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئەزموونەکان دەنێرن.

## لقی دووەم

### بڕوانامەکان

### ماددەی (125):

**یەکـەم**: ئـەو دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییانـەی پرۆگرامـی وەزارەت دەخوێنن، دەکەونە ژێر هەمان مەرج و ڕێکاری پێدانی کارتی هەڵسەنگاندن و بڕوانامەی نمرە و بەڵگەنامەی دەرچوون، ئەوانەی کە لە دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا پەیڕەو دەکرێن.

**دووەم**: کارتـی هەڵسـەنگاندن، بڕوانامـەی نمـرە و بەڵگەنامـەی دەرچوونـی هـەر قۆناغێک لـەو دامەزراوانـە، هاوتایە لەگـەڵ کارتی هەڵسـەنگاندن و بڕوانامـەی نمـرە و بەڵگەنامـەی دەرچـوون لـە دامەزراوەی پەروەردەیی حکومی.

**سـێیەم**: ئـەو دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییانـەی پرۆگرامـی نێودەوڵەتـی و بیانـی دەخوێنـن، دەکەونـە ژێـر ئـەو مـەرج و ڕێکارە تایبەتانـەی پێدانـی کارتـی هەڵسـەنگاندن، بڕوانامـەی نمـرە و بەڵگەنامەی دەرچوون، کە پێشـتر لەلایەن دامەزراوەکە پێشـکەش بە وەزارەت کراوە و ڕەزامەندی لەسەر دراوە.

**چـوارەم**: بەڵگەنامـەی دەرچـوون لە پۆلـی دوازدەیەمـی خوێندنگە ناحکومییـە نێودەوڵەتییـەکان، لـە سـەر بنەمـای دەرچـوون لـە تاقیکردنـەوە نێودەوڵەتییەکان دەدرێـت و بەڵگەنامەی دەرچوون لە پۆلی دوازدەیەمی خوێندنگە ناحکومییە بیانییەکان لەسـەر بنەمای دەرچوون لە تاقیکردنەوە بیانییەکان دەدرێت.

**پێنجەم**: وەزارەت تاکە لایەنە کە مافی پشتگیریکردن و هاوتاکردنی بەڵگەنامەکانی دەرچوونی هەیە.

# تەوەری چوارەم
# حوکمە هاوبەشەکان

**ماددەی (126):**

**یەکـەم**: هـەر سـاڵێکی خوێنـدن لـە دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان، لانیکـەم لـە (170) سـەد و حەفتـا ڕۆژی خوێنـدن پێکدێت، هیچ ڕۆژێکی خوێندن لە (5) پێنج کاتژمێر کەمتر نابێت.

**دووەم**: سـاڵنامەی خوێنـدن و کاتەکانـی دەوام و پشـووەکان لـە دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان، بەپێـی ئـەو پرۆگرامـە ڕێکدەخرێت کە پێشـتر ڕەزامەندی لەسـەر وەرگیراوە لە وەزارەت، بە ڕەچاوکردنی بڕگەی (یەکەم)ی ئـەم ماددەیە و حوکمەکانی ماددەی (27) ی ئەم یاسایە.

**سـێیەم**: دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان دەتوانـن ڕۆژ و کاتژمێـری زیاتـر بخوێنـن، وەک لـەوەی لـە بڕگـەی (یەکـەم)ی ئەم ماددەیەدا هاتووە، هەروەها دەتوانن لەو ڕۆژانەدا بخوێنن کە بەپێی ماددەی (27) پشوو نییە.

**چـوارەم**: دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییەکان دەتوانن سـوود لە سیستەمی (2) دوو مامۆستا لە پۆل وەربگرن، کە یەکێکیان دەبێت بـە مامۆسـتای سـەرەکی و ئـەوەی دیکـەش دەبێتـە مامۆسـتای هاوکار.

**ماددەی (127):**

ڕێکارەکانـی گواسـتنەوەی قوتابـی و خوێنـدکار لە نێـوان دامەزراوە پەروەردەییـە حکومی و ناحکومییەکاندا، بەپێی ڕێنماییەک کە وەزیر دەریدەکات، ڕێکدەخرێت.

**ماددەی (128):**

**یەکـەم**: هەموو قوتابخانە و خوێندنگە و کۆمەڵگەی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشـەیی ناحکومی، لە سـاڵی یەکەمی

دامەزراندنیدا، دەتوانێت بە **(1) یەک پۆل دەست پێبکات.**

**دووەم:**

1 - ئـەو قوتابخانـە بنەڕەتییـە ناحکومییـەی کـە لە سـاڵی یەکەمی خوێندندا گشـت پۆلەکانی یەک بازنەی خوێندنـی تێدا نییە، دەبێت بـۆ سـاڵی دواتر پۆلـی نوێ بکاتـەوە، بۆ ئەوەی لە ماوەی (3) سـێ ساڵی خوێندندا ببێتە خاوەن گشت پۆلەکانی یەک بازنەی خوێندن.

2 - ئـەو خوێندنگـە ناحکومییـەی کـە لە سـاڵی یەکەمـی خوێندندا گشـت پۆلەکانـی ئامادەیی تیـدا نییە، دەبێت بۆ سـاڵی دواتر پۆلی نـوێ بکاتـەوە، بۆ ئەوەی لە ماوەی (٣) سـێ سـاڵی خوێندندا ببێتە خاوەن گشت پۆلەکانی خوێندنی ئامادەیی.

3 - ئـەو پەیمانگە پەروەردەییە پیشـەییە ناحکومییەی کە لە سـاڵی یەکەمـی خوێندنـدا گشـت پۆلەکانـی پەیمانگـەی پەروەردەیـی پیشـەیی تێـدا نییـە، دەبێت بۆ سـاڵی دواتر پۆلی نـوێ بکاتەوە، بۆ ئـەوەی لـە مـاوەی (5) پێنـج سـاڵی خوێندنـدا ببێتە خاوەن گشـت پۆلەکانی خوێندنی پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی.

4 - کۆمەڵگـەی پەروەردەیـی ناحکومـی دەبێـت لە سـاڵی یەکەمی خوێندندا، لانیکەم پۆلێکی لە هەر قۆناغێکی خوێندن هەبێت و هەر سـاڵێکی خوێندن پۆلێکی نوێ زیاد بکات، بۆ ئەوەی سـاڵ لە دوای ساڵ ببێتە خاوەن گشت پۆلەکانی خوێندن.

**سـێیەم**: هەموو قوتابخانەیەکی بنەڕەتی ناحکومی، بۆ درێژەدان بە خوێندن، دەتوانێت خوێندنی قۆناغی ئامادەیی بکاتەوە، بەمەرجێک لای وەزارەت مۆڵەتی بۆ وەربگرێت.

## بەشی سێیەم
## پێکهاتە کارگێڕییەکان لە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکاندا

---

## تەوەری یەکەم
## بەڕێوەبەر، یاریدەدەری بەڕێوەبەر، مامۆستا و کارمەندان

**ماددەی (129):**

**یەکەم**: پێویستە هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی بەڕێوەبەرێکی هەمیشەیی هەبێت.

**دووەم:**

1 - ئەگەر ژمارەی منداڵان لە باخچەیەکی منداڵان لە (150) سەد و پەنجا منداڵ زیاتر بوو، پێویستە یاریدەدەرێکی بەڕێوەبەر دابنرێت.

2 - ئەگەر ژمارەی قوتابیان و خوێندکارانی قوتابخانە، یان خوێندنگە، یان کۆمەڵگەی پەروەردەیی یان پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی ناحکومی، گەیشتە (150) سەد و پەنجا، یاریدەدەرێکی بەڕێوەبەر، یان زیاتری بۆ دادەنرێت.

**سێیەم**: پێویستە هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی ژمارەیەک مامۆستای هەبێت کە لەگەڵ ژمارەی منداڵان، یاخود قوتابیان و خوێندکارانیاندا بگونجێت و ناکۆک نەبێت لەگەڵ ڕێنماییەکانی وەزارەت.

**چوارەم**: پێویستە هەموو قوتابخانە، خوێندنگە، کۆمەڵگەی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی ناحکومی، ڕێنماییکارێکی پەروەردەیی بۆ هەر (125) سەد و بیست و پێنج قوتابی و خوێندکارێک هەبێت.

**پێنجەم**: پێویستە هەموو قوتابخانە، خوێندنگە و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی ناحکومی، فەرمانبەرێکی تەندروستی هەبێت، یان خزمەتگوزاری تەندروستی لە ڕێگەی گرێبەستێک لەگەڵ دامەزراوەیەکی تەندروستی دابین بکات.

**شەشەم**: پێویستە هەموو کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی ناحکومی بەڕێوەبەرێکی خاوەن بڕوانامەی زانکۆی هەبێت، هەروەها بەڕێوەبەرێک بۆ هەر یەک لە بەشەکانی باخچەی منداڵان و قۆناغی بنەڕەتی و قۆناغی ئامادەیی دابنێت. بەڕێوەبەری کۆمەڵگە بەرپرسی یەکەمی کاری ئەکادیمی و کارگێڕیی و دارایی دەبێت، هەروەها ئەرکی سەرەکی سەرپەرشتیاری و دڵنیایی جۆریی لە گشت قۆناغەکانی خوێندن لە کۆمەڵگەکەدا دەکەوێتە ئەستۆی.

**حەوتەم**: هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی، دەبێت ژمارەیەک کارمەند دابمەزرێنێت، بەپێی پێداویستی دامەزراوەکە و بەو ناونیشانەی دامەزراوەکە پێویستیەتی.

**ماددەی (130):**

**یەکەم:**

1 - دەبێت ڕێژەی مامۆستا هەمیشەییەکانی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان لە (80%) هەشتا لە سەدی کۆی ژمارەی مامۆستایانی دامەزراوەکە، کەمتر نەبێت.

2 - دەبێت ڕێژەی مامۆستا هەمیشەییەکان لە هەر یەک لە (3) سێ قۆناغەکەی کۆمەڵگەی پەروەردەیی لە (80%) هەشتا لە سەدی مامۆستایانی قۆناغە پەیوەندیدارەکەی کۆمەڵگەکە کەمتر نەبێت.

3 - دەبێت لانیکەم (80%) هەشتا لە سەدی بەشە وانەکانی هەر یەک لە دوازدە ساڵەکەی خوێندنی قوتابخانە و خوێندنگە و کۆمەڵگەی پەروەردەیی و (5) پێنج ساڵەکەی پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی بە مامۆستا هەمیشەییەکان بدرێت.

**دووەم**:

1 - لـە کاتی دەوامی فەرمی دامـەزراوە پەروەردەییە حکومییەکاندا، هیچ دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی مافی نییە مامۆستایان و کارمەندانی پەروەردەیی دیکە و سەرپەرشتیاران و کادیرانی دیوانی وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتییـە گشـتییەکان بەکاربخات، ئەوانە نەبێت کە مۆڵەتی بێ مووچەیان وەرگرتووە، یان خواستراون.

2 - تەنهـا پێـش دەسـتپێکردن، یـان دوای تەواوبوونـی دەوامـی فەرمـی ئـەو دامـەزراوە پەروەردەییـە حکومییـەی، کە مامۆسـتا و فەرمانبـەرە حکومییەکە کاری تێدا دەکات و دوای مۆڵەت وەرگرتنی نووسـینەکی لـە دامـەزراوە پەروەردەییـە حکومییەکـە لەلایـەن مامۆستا و فەرمانبەرەوە، دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی مافی بەکارخستنی مامۆستا و فەرمانبەری پەروەردەیی حکومی هەیە.

**سـێیەم**: هیـچ کـەس ناتوانێـت لـە یـەک کاتـدا بەڕێوەبـەری دوو دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی بێت.

**چـوارەم**: هـەر مامۆسـتایەک بەهـۆکاری تەندروسـتی خانەنشـین کرابێت، مافـی کارکردنی لە دامـەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکاندا نییە.

**پێنجـەم**: پێویسـتە دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان، لـە مانگـی یەکەمـی سـاڵی خوێندنـدا، نـاوی ئەندامانـی کارگێڕیـی و مامۆستایانیان بۆ وەزراەت بنێرن.

**شەشەم**:

1 - بەڕێوەبەری هەمیشەیی، یاریدەدەری بەڕێوەبەری هەمیشەیی، مامۆستای هەمیشەیی و ڕێنماییکاری پەروەردەیی هەمیشەیی لە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکاندا ئەوانەی خوارەوەن:-

أ- ئەوانـەی لە دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییەکە دامـەزراون بێ ئەوەی لە کەرتی گشتی کار بکەن.

ب- ئەوانەی تەمەنیان لە (63) شەست و سێ ساڵ تێپەر نەبووە.

ج- ئەوانـەی لە دامەزراوەکە دامەزراون بۆ ئەوەی گرێبەسـتی کاری هەمیشەییان لە گەڵ شوێنێکی دیکە هەبێت.
2 - بەڕێوەبـەر، یاریـدەدەری بەڕێوەبـەر، مامۆسـتا و ڕێنماییـکاری پەروەردەیی کەرتی گشـتی، کە خواستراون یان خاوەنی مۆڵەتی بێ مووچەن، بەکارمەندی هەمیشەیی هەژمار ناکرێن.

## تەوەری دووەم
## مافەکانی کارمەندانی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان

**ماددەی (131):**

**یەکـەم**: خاوەنـی دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومی، بەرپرسـە لە پاراستنی ماف و شایستە ماددی و مەعنەوییەکانی کارمەندەکانی لـە ماوەی خزمەتکردنیان لە دامەزراوەکـەدا، هەروەها پابەند دەبێت بە ڕەخسـاندنی دەرفەتی شیاندن و فێربوونی بەردەوام و ڕاهێنانیان لەسەر پرۆسەی دڵنیایی جۆریی.

**دووەم**: پێویسـتە دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومـی، ئـەو تۆمارانـەی هەبێت کە یاسـای دەسـتەبەری کۆمەڵایەتی بەمەرجی گرتوون، ئەوەش بەمەبەسـتی جێگیرکردنی مافەکانی مامۆسـتا و کارمەندەکانی.

**سـێیەم**: کارمەندانـی دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان، مافی پشـوویان بە پێی گرێبەسـتی نێـوان کارمەنـد و دامەزراوەکە دەستنیشـان دەکرێـت، بەڕەچاوکردنـی حوکمەکانـی یاسـای کاری بەرکار لە هەرێم.

**چوارەم**: بەڕێوەبەر، یاریدەدەری بەڕێوەبەر، مامۆسـتا و ڕێنمایکاریی پەرورەدەیـی دامـەزراوە پەروردەییـە ناحکومییـەکان، مافـی

بەشداریکردنیان لە خولی بەهێزکردنی تواناکان و فێربوونی بەردەوام هەیە، کە لە ساڵێکدا نابێت لە (30) سی کاتژمێر کەمتر بێت و لەسەر خەرجی دامەزراوەکە بۆیان دەکرێتەوە.

**پێنجەم**:

1 - نابێت کاتژمێرەکانی کارکردنی کارمەندانی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان لە (8) هەشت کاتژمێر لە ڕۆژێکدا و لە (40) چل کاتژمێر لە حەفتەیەکدا، زیاتر بێت.

2 - ژمارەی بەشە وانەکانی مامۆستایان بەپێی ئەو گرێبەستە دەبێت کە لە نێوان دامەزراوەکە و مامۆستاکە بەستراوە، بە ڕەچاوکردنی کاتژمێرەکانی کار لە هەفتەیەکدا.

3 - لە حاڵەتی کارکردنی زیادە، یان وتنەوەی بەشە وانەی زیاتر وەک لەوەی لە گرێبەستەکەدا هاتووە، دەبێت دامەزراوەکە مافی هەر کاتژمێرێکی کارکردنی زیادە بە مامۆستا و کارمەندە پەیوەندیدارەکە بدات.

**شەشەم**:

1 - کەمترین بڕی مووچەی مانگانەی کارمەندانی باخچە ناحکومییەکان، نابێت لە کۆی مووچەی بنەڕەتی و دەرماڵە جێگیرەکانی هاوتاکانیان لە کەرتی گشتی کەمتر بێت.

2 - کەمترین بڕی مووچەی مانگانەی کارمەندانی قوتابخانە، خوێندنگە و پەیمانگە ناحکومییەکان، نابێت لە شایستەی دارایی هاوتاکانیان لە کەرتی گشتی کەمتر بێت.

**حەوتەم**: لە پشووی هاویندا، مووچەی مامۆستا و کارمەندانی هەمیشەیی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان بە پێی گرێبەستی نێوان کارمەند و دامەزراوەکە دەبێت و لە هیچ بارێکدا نابێت لە (70%) حەفتا لە سەدی مووچەی مانگانە کەمتربێت.

**هەشتەم**: خاوەنی دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی، بە بێ دیاریکردنی هۆیەکەی، مافی دەرکردنی بەڕێوەبەر، یان کارمەندانی

وانەوتنـەوە و کارمەندانـی دیکـەی نییە، کە دەبێت پشتبەسـت بە ڕاسـپاردەی لیژنەیـەک کـە بۆ ئـەو مەبەسـتە لەلایـەن دامەزراوەکە دروست دەکرێت، دوای ئەوەی ڕەزامەندی وەزارەتی بۆ وەردەگیرێت، بڕیاری لە بارەوە بدرێت.

**نۆیـەم**: مەرجەکانی بەکارخسـتن و هەڵوەشـاندنەوەی گرێبەسـت و ناکۆکییەکانـی نێـوان دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان و مامۆستایان و کارمەندانی دیکەی دامەزراوەکە، بەپێی حوکمەکانی یاسـای کاری بـەرکار لـە هەرێم مامەڵەیـان لەگەڵ دەکرێـت، ئەگەر دەقێکی دیکەی جیاواز لەم یاسایەدا نەهاتبێت.

**دەیـەم**: سـاڵەکانی کارکردنـی بەڕێوەبـەر، یاریـدەدەری بەڕێوەبـەر، مامۆسـتا، ڕێنماییـکاری پەروەردەیـی لـە دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومـی، بـە ڕاژەی کردەیـی بـۆ گشـت مەبەسـتەکان هەژمـار دەکرێت.

## تەوەری سێیەم
## بەکارخستن لە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان

**لقی یەکەم**

**مەرجەکانی بەکارخستن**

**ماددەی (132):**

**یەکەم**: مەرجەکانی دامەزراندنی بەڕێوەبەر:-

1 - لانیکەم خاوەنی بڕوانامەی بەرایی زانکۆ بێت.

2 - ئەزموونی کار یان چالاکی لە بواری پەروەردە و فێرکردن لە (5) پێنج ساڵ کەمتر نەبێت، لە عێراق یان دەرەوەی عێراق.

3 - بە تاوانی ئابڕووبەر حوکم نەدرابێت و سزای کارگێڕیی (سەرزەنشت) و زیاتر نەدرا بێت.

4 - دەکرێت هەڵگرانی بڕوانامەی زانکۆ، هەرچەندە خوێندنەکەیان لە بواری پەروەردە نەبووبێت، وەک بەڕێوەبەر بەکاربخرێن، بە مەرجێک پێش دامەزراندنیان خولی شیاندنی بەڕێوبەریان بینیبێت.

**دووەم**: مەرجەکانی دامەزراندنی یاریدەدەری بەڕێوەبەر:-

1 - دەبێت یاریدەدەری بەڕێوەبەری باخچەی منداڵان بڕوانامەی زانکۆی لە بواری پەروەردەدا هەبێت.

2 - دەبێت یاریدەدەری بەڕێوەبەری قوتابخانە و پەیمانگەی پەروەردەیی پیشەیی بڕوانامەی زانکۆی لە بواری پەروەردەدا هەبێت، ئەزموونی لە بواری پەروەردە لە (5) پێنج ساڵ کەمتر نەبێت.

3 - بە تاوانی ئابڕووبەر حوکم نەدرابێت و سزای کارگێڕیی (سەرزەنشت) و زیاتر نەدرابێت.

**سێیەم**: مەرجەکانی دامەزراندنی مامۆستا و ڕێنماییکاری پەروەردەیی، هەمان ئەو مەرجانە دەبێت کە بۆ مەبەستی دامەزراندنیان لە کەرتی گشتی، بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە

دانراوە.

**چوارەم**:

1 - بەڕێوەبەر و یاریدەدەری بەڕێوەبەر، لەسەر خەرجی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکە، لە یەکێک لەو خولانەی شیاندن بەشدار دەبن کە وەزارەت ساڵانە ڕێکیدەخات.

2 - مامۆستا و ڕێنماییکاری پەروەردەیی لەسەر خەرجی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومیەکە، لە یەکێک لەو خولانەی شیاندن و دڵنیایی جۆریی بەشداردەبن کە وەزارەت ساڵانە ڕێکیدەخات.

## لقی دووەم

### گرێبەستی دامەزراندن

### ماددەی (133):

**یەکەم**: پێویستە گرێبەست لەنێوان دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی و هەر کارمەندێکی دامەزراوەکەدا هەبێت.

**دووەم**: دەبێت گرێبەستەکە ماوەی کارکردن، بڕی مووچە، کات و شێوازی کار، پشووەکان و مافەکانی دیکەی کارمەندان و سزاکانی جێبەجێنەکردنی ئەرکەکانی تێدا هاتبێت.

**سێیەم**: گرێبەستی دامەزراندنی بەڕێوەبەر لە نێوان بەڕێوەبەر و خاوەنی دامەزراوەکە، یان ئەوەی نوێنەرایەتی دەکات واژۆ دەکرێت.

**چوارەم**: گرێبەستی دامەزراندنی کارمەندانی دیکە، لە نێوان کارمەندەکە و بەڕێوەبەر واژۆ دەکرێت.

**پێنجەم**: دەبێت وێنەیەکی گرێبەستەکە بە تەواوی پاشکۆکانییەوە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی ناحکومی دابنرێت.

## تەوەری چوارەم
## ئەرکەکانی بەڕێوەبەر لە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکاندا

**ماددەی (134):**

بەڕێوەبەر نوێنەرایەتی دامـەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکە دەکات و ئەم ئەرکانەی هەیە:-

**یەکـەم**: ئەو ئەرکانـەی لە بڕگەکانی مـاددەی (57)ی ئەم یاسـایەدا هاتـوون و لەگەڵ سروشـتی ئەرکـەکانی بەڕێوەبەر لـە دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومیدا دەگونجێن.

**دووەم**: بەرزکردنـەوەی پێشـنیاز بـۆ خـاوەن دامەزراوەکـە سـەبارەت بە گرێبەسـت لەگـەڵ کارمەنـدان بەپێی پێویسـتی، یان هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستیان.

**سـێیەم**: هـەر ئەرکێکـی دیکـەی پەروەردەیـی کـە لەلایـەن خـاوەن دامەزراوەکەوە، پێی ڕادەسپێردرێت.

**ماددەی (135):**

**یەکەم**: ئەو ئەرکانەی لە ماددەکانی (58، 59، 60)ی ئەم یاسـایەدا هاتوون، بەسـەر یاریـدەدەری بەڕێوەبەر و مامۆسـتا و ڕێنماییکاری پەروەردەیـی لـە دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییەکانـدا، جێبەجێ دەکرێت.

**دووەم**: دامـەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان دەتوانن ئەرکی دیکە بـە یاریـدەدەری بەڕێوەبـەر و مامۆسـتا و ڕێنماییـکاری پەروەردەیی بسپێرن، بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی لەگرێبەستی دامەزراندندا هاتووە.

# تەوەری پێنجەم
# ئەنجومەنی کارگێڕیی دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی

**لقی یەکەم**

**پێکهێنانی ئەنجومەن**

**ماددەی (136):**

**یەکەم**: لە هەر قوتابخانە و خوێندنگە و کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکـی پەروەردەیی پیشـەیی ناحکومیـدا، ئەنجومەنێک پێکدەهێنرێـت، بـە سـەرۆکایەتی خـاوەن دامەزراوەکە، یـان ئەوەی نوێنەرایەتی دەکات و ئەندامیەتی هەر یەک لە:-

1 - بەڕێوەبەری دامەزراوەکە.

2 - دوو نوێنەری دەستەی مامۆستایان.

3 - ڕێنماییکاری پەروەردەیی، ئەگەر لە دامەزراوەکەدا هەبێت.

**دووەم**: لە هەر باخچەیەکی منداڵانی ناحکومیدا کە ژمارەی منداڵانی لـە (50) پەنجـا منـداڵ زیاتـر بـوو، ئەنجومەنێـک پێکدەهێنرێت، بە سـەرۆکایەتی خاوەن دامەزراوەکە، یان ئـەوەی نوێنەرایەتی دەکات و ئەندامیەتی هەر یەک لە:-

1 - بەڕێوەبەری باخچەکە.

2 - دوو نوێنەری دەستەی مامۆستایان.

3 - چاودێرێک.

**سـێیەم**: بڕیارەکانی ئەنجومەنی هاتوو لە بڕگەی (یەکەم) و(دووەم) ی ئـەم ماددەیـەدا، پـاش ڕەزامەنـدی خـاوەن دامەزراوەکـە، یـان نوێنەرەکەی، بە پەسەندکراو هەژمار دەکرێن.

### لقی دووەم

### ئەرکی ئەنجومەنی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان

**ماددەی (137):**

**یەکەم**: بەدواداچوون بۆ بەڕێوەچوونی پرۆسەی خوێندن و پرۆسەی دڵنیایی جۆریی لە دامەزراوەکە و هەڵسەنگاندنی وەرزانەیان.

**دووەم**: بەدواداچوون بۆ وردەکارییەکانی پلانی ساڵانەی دامەزراوەکە.

**سێیەم**: تاوتوێکردن و چارەسەرکردنی ئەو پرسە گرنگانەی پەیوەست بە دامەزراوەکەن، بەڕێوەبەر داوا لە ئەنجومەن دەکات لەو بوارەدا یارمەتی بدەن.

**چوارەم**: بەڕێوەبردنی دامەزراوەکە بە جۆرێک کە لەگەڵ ئامانجەکانی ئەم یاسایەدا، بگونجێت.

## تەوەری شەشەم
## لیژنەکانی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان

**ماددەی (138):**

لە هەر قوتابخانە و خوێندنگە و کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی و پەیمانگەیەکی پەروەردەیی پیشەیی ناحکومی، بەڕێوەبەر لانیکەم ئەو (6) شەش لیژنەیە دادەنێت کە لە ماددەی (75) ی ئەم یاسایەدا هاتووە.

## بەشی چوارەم
## سیستەمی دارایی

---

## تەوەری یەکەم
## کرێی ساڵانەی خوێندن

**ماددەی (139):**

**یەکەم**: هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی مافی وەرگرتنی کرێی ساڵانەی خوێندنی هەیە.

**دووەم:**

1 - کرێی ساڵانەی خوێندن کتێبەکانی خوێندن و جلی یەکپۆشی ساڵی خوێندن لەخۆدەگرێت، بە ڕەچاوکردنی حوکمی بڕگەی دووەمی ماددەی (30)ی ئەم یاسایە.

2 - هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی کە پێش دەرچوونی ئەم یاسایە دەستبەکار بووە، دەبێت لە ماوەی (3) سێ ساڵ لە دەرچوونی ئەم یاسایە لەگەڵ حوکمەکانی خاڵی (1)ی ئەم بڕگەیە خۆی بگونجێنێت.

**سێیەم**: دامەزراوە مافی هەیە بڕی تێچووی خواردن و کرێی هاتووچۆی قوتابی و خوێندکار وەربگرێت، بە مەرجێک ئارەزوومەندانە بێت.

**چوارەم**: دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان مافیان نییە، بێ ڕازیبوونی بەخێوکار، یان بێ ڕازیبوونی خودی قوتابی یان خوێندکار ئەگەر تەمەنی (18) هەژدە ساڵ یان زیاتر بوو، هیچ بارگرانییەکی دارایی بخەنە ئەستۆیان، جگە لەو کرێیانەی کە لەم ماددەیەدا هاتوون.

**پێنجەم**:

1 - دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان دەتوانـن لەسـەر کرێی سـاڵانەی خوێندنـی خۆیان، کـە لە کاتـی وەرگرتنی مۆڵـەت بڕیاری لێدراوە بەردەوام بن، بێ هیچ دەستێوەردانێک.

2 - بـەدەر لـە خاڵـی (1)ی ئـەم بڕگـەیـە، وەزارەت لـە کاتی قەیـرانی داراییـدا، دەسـەڵاتی کەمکردنـەوەی کرێـی خوێنـدنی بەڕێژەیەکـی گونجاو هەیە.

**شەشەم:**

1 - ئەگـەر بەخێـوکار لـە مـاوەی (30) سـی ڕۆژ لە پێدانی قیسـتی یەکەم، پەشـیمان بـوو لە دانانی یـان بەردەوامبوونـی منداڵەکەی یـان قوتابـی یـان خوێندکارەکـەی لـە دامەزراوەکـە، ئەرکـە لەسـەر دامەزراوەکە (90%) نەوەد لە سەدی پارەکە بۆ بەخێوکار بگەڕێنێتەوە و گەڕاندنەوەکە پارەی کتێب و جلوبەرگی بەکارهاتوو ناگرێتەوە.

2 - منداڵ و قوتابی و خوێندکار لە کرێی وەرزی دووەم دەبەخشرێت، ئەگـەر پێـش دەسـپێکی وەرزەکـە دامەزراوەکـەی بەجێهێشـت بـە کشانەوە یان گواستنەوە.

**حەوتـەم**: ئەرکـی دامەزراوەکەیە پێش دەسـپێکی سـاڵی خوێندن، یـان پێـش دەسـپێکردنی خوێندنـی منـداڵ و قوتابـی و خوێندکار، گرێبەسـتێک لەگـەڵ بەخێـوکار سـەبارەت بـە مـاف و ئەرکەکانـی هەردوو لایەن بکات، بەمەرجێک ناوەڕۆکەکەی بە زمانی دایک بێت و هیچ بڕگەیەکی گرێبەسـتەکە لەگـەڵ هیچ مادده و بڕگەیەکی ئەم یاسایە ناکۆک نەبێت.

**هەشـتەم**: هەر قوتابی یان خوێندکارێک یەکەمی سـەر ئاستی هەر پۆلێـک لـە پۆلەکانـی خوینـدن بێـت، لانیکـەم لـە (50%) پەنجا لە سەدی کرێی خوێندنی ساڵەکە دەبەخشرێت.

**ماددەی (140):**

**یەکەم**:

1 - کرێی ساڵانەی خوێندن لانیکەم بە (3) سێ قیست دەبێت.

2 - قیستی یەکەم لە کاتی تۆمارکردن، یان پێش دەستپێکردنی ساڵی خوێندن دەدرێت.

3 - قیستی دووەم لە کاتی دەستپێکی وەرزی دووەم دەدرێت، قیستی سێیەمیش لەگەڵ وەرگرتنەوەی کارتی نمرە.

**دووەم**: ئەگەر بەخێوکار پابەند نەبوو بە دانی کرێی ساڵانەی خویندن لە کاتی خۆیدا، دامەزراوە مافی هەیە داوا لە وەزارەت بکات بە گواستنەوەی منداڵ و قوتابی و خوێندکار بۆ دامەزراوەیەکی دیکە، دەبێت وەزارەت لە ماوەی (15) پازدە ڕۆژ لە ڕێکەوتی داواکەوە بڕیاری گواستنەوەکە و جێبەجێکردنی بدات.

**سێیەم**: بۆ وەرگرتنی کرێی ساڵانی خوێندن، دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی مافی کردنەوەی ژمارەی بانکی هەیە.

## تەوەری دووەم
## باجەکان

**ماددەی (141):**

باجەکانی سەر دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان، بەپێی یاسا بەرکارەکانی هەرێم دەبێت، بە ڕەچاوکردنی ئەوەی لە ماددەی (164)ی ئەم یاسایەدا هاتووە.

## بەشی پێنجەم
## سیستەمی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن و هەڵسەنگاندن لە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکاندا

**ماددەی (142):**

هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی کە پرۆگرامی حکومی بەکار دەهێنێت، پێویستە پابەندی سیستەمی سەرپەرشتیکردن و دڵنیایی جۆریی و هەڵسەنگاندنی وەزارەت بێت.

**ماددەی (143):**

**یەکەم**: هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومی کە پرۆگرامی تایبەت بە خۆی پیادە دەکات، ئەوەی کە پێشتر لەلایەن وەزارەتەوە پەسەند کراوە، دەبێت بەشی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن و هەڵسەنگاندنی تایبەتی خۆی هەبێت.

**دووەم**: هەر کات وەزارەت بە پێویستی بزانێت، مافی سەرپەرشتیکردنی ئەو دامەزراوانەی هەیە کە پرۆگرامی خوێندنی خۆیان پیادە دەکەن.

**ماددەی (144):**

**یەکەم**: ئەرکی هەموو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ناحکومییە، بەر لە کۆتایی مانگی تەمموز، هەڵسەنگاندنی ساڵانە بۆ چالاکییەکانی دامەزراوەکە و چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ساڵی خوێندنی پێشوو بکەن، بۆ ئەوەی لە کاتی دانانی پلانی ئایندەدا سوودی لێ وەربگیرێت.

**دووەم**: هەڵسەنگاندنی ساڵانەی ئەو دامەزراوانەی کە پرۆگرامی حکومی پیادە دەکەن، بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت:-

1 - هەڵسەنگاندنی ساڵانەی کارمەندانی پەروەردەیی لەلایەن بەڕێوەبەرەوە.
2 - ئەنجامەکانی پرۆسەی هەڵسەنگاندن لە تۆمارەکانی دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکاندا تۆمار دەکرێن و پوختەیەکیشی بەشێوەی فۆرمێک بۆ وەزارەت وبەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەروەردەی پارێزگاکان، یان ئیدارە سەربەخۆکان، دەنێردرێت.
3 - هەڵسەنگاندنی ساڵانە بۆ دیاریکردنی خاڵە بەهێز و لاوازەکانی کارمەندەکان و دامەزراوەکە دەکرێت و وەک بنەمایەک بۆ پێشکەشکردنی سوپاس و پێزانین بەکاردێت.
4 - دامەزراوەکان لەلایەن لیژنەیەکی هەڵسەنگاندنی وەزارەت و بەپێی پێوەر و فۆرمی تایبەت، کە بەر لە دەستپێکی ساڵی خوێندن بە سەر دامەزراوەکاندا دابەشدەکرێن، هەڵسەنگاندنیان بۆ دەکرێت، ئەنجامی ئەو هەڵسەنگاندنە بە گشتی، وەک هەڵسەنگاندنی بەڕێوەبەر و دامەزراوەکە هەژمار دەکرێت.
**سێیەم**: هەڵسەنگاندنی ساڵانەی ئەو دامەزراوانەی کە پرۆگرامی خۆیان بەکاردێنن بەپێی ئەو پێوەرانە دەبێت کە لەکاتی داواکردنی مۆڵەت پێشکەش بە وەزارەت کراوە و ڕەزامەندی لەسەر وەرگیراوە، بە ڕەچاوکردنی حوکمەکانی بڕگەی (دووەم)ی ماددەی (143)ی ئەم یاسایە.

# بەشی شەشەم
# حوکمە گشتییەکان

**ماددەی (145):**

**یەکـەم**: هەمـوو قوتابخانـە و خوێندنگـە و کۆمەڵگـە و پەیمانگـە پەروەردەییـە پیشـەییە ناحکومییـەکان، جلـی یەکپۆشـی تایبەت بە خۆیان دەبێت کە لەلایەن دامەزراوەکەوە دیزاین دەکرێت.

**دووەم**: دەکرێـت قوتابخانـە ناحکومییەکان، پـاش دەوامی فەرمی قوتابخانە، شوێنی حەواندنەوە بۆ قوتابییانی خۆیان بکەنەوە، پاش وەرگرتنـی مۆڵەت لـە وەزارەت و کرێی مانگانە بەپێی گرێبەسـتێکی نێوان بەخێوکار و قوتابخانە ناحکومییەکە دەبێت.

**ماددەی (146):**

یەکـەم: دەبێـت دامـەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکان، گشـت ئەو تۆمارانەیان هەبێت کە وەزیر لە ڕێگەی ڕێنماییەوە دیاریاندەکات.

**دووەم:**

1 - دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومی قازانج نەویسـت، دەبێت لە پەیـڕەوی دامەزرانیدا هاتبێت کە قازانج نەویسـتە و سـاڵانە لەلایەن وەزارەتـەوە چاودێـری دەکرێـت بەمەبەسـتی دڵنیابـوون لـەوەی کە قازانجی دامەزراوەکە بۆ پەرەپێدانی دامەزراوەکە و قوتابی و خوێندکار و مامۆستا و کارمەندانی دیکەی دامەزراوەکە، خەرج دەکرێت.

2 - ژمێـرکاری دامەزراوەکـە لەژێـر وردبینـی دیـوانی چاودێـری دارایی هەرێمدا دەبێت.

**ماددەی (147):**

دامـەزراوە پەروەردەییـە ناحکومییـەکان، مافـی کردنـەوەی خولـی بەهێزکردنیان تەنها بۆ قوتابیان و خوێندکارانی خۆیان هەیە.

**ماددەی (148):**

**یەکەم**: ئـەو دامـەزراوە پەروەردەییە ناحکومییانـەی مۆڵەتیان پێش دەرچوونـی ئەم یاسـایە وەرگرتـووە، مافی هێشـتنەوە، یان گۆڕینی نـاوی خۆیـان هەیـە، بـە مەرجێـک مۆڵـەت لـە وەزارەت وەربگـرن و ڕەسمی پێویست بدەن.

**دووەم**: خاوەنـی دامەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومی خۆماڵی مافی گۆڕینـی دامەزراوەکـەی بـۆ دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتـی هەیە، بەم مەرجانەی خوارەوە:-

1 - نووسراوێکی متمانەبەخشـین (ئەکریدیتەیشـن) لـە ناوەندێکی جیهانی باوەڕپێکراو پێشکەش بکات.

2 - پرۆگرام و شـێوازی تاقیکردنەوە و هەڵسـەنگاندنی باوڕەپێکراوی هەبێت.

3 - ڕەسمی گۆڕینی مۆڵەت کە (50%) پەنجا لە سەدی بڕی ڕەسمی پێدانی مۆڵەتە بدات.

4 - گۆڕانکارییەکە گشت قۆناغەکان بگرێتەوە، بەڵام لە پۆلی یەکەم دەسـت پـێ بـکات و ئـەو قوتابـی و خوێندکارانـەی پێـش گۆڕینـی دامەزراوەکە بۆ دامەزراوەیەکـی نێودەوڵەتی، لە دامەزراوەکە بوون، هەر بە سیستەمی خۆماڵی خۆیان بەردەوام دەبن.

**ماددەی (149):**

**یەکـەم**: هـەر دامەزراوەیەکـی پەروەردەیـی ناحکومـی، سـەرپێچی پابەندییەکانی بەپێی ئەم یاسـایە و ڕێنماییەکانی وەزارەت بکات، بە پێبژاردنێک سزا دەدرێت کە لە (10,000,000) دە ملیۆن دینار کەمتر نەبێت و لە (150,000,000) سەد و پەنجا ملیۆن دینار زیاتر نەبێت، سـەرباری ئـەوە وەزارەت مافـی هەڵوەشـاندنەوەی مۆڵەتەکەشـی هەیە.

**دووەم**: هەر کەس و لایەنێک، بێ ڕەزامەندی فەرمی وەزارەت، دامەزراوەی ناحکومی بکاتەوە، بە پێبژاردنێک کە لە (50,000,000) پەنجا ملیۆن دینار کەمتر نەبێت و لە (150,000,000) سەد و پەنجا ملیۆن دینار زیاتر نەبێت، سزا دەدرێت و وەزارەت دامەزراوەکە دادەخات.

**سێیەم**: سزاکانی بڕگەکانی (یەکەم) و (دووەم)ی ئەم ماددەیە، ڕێگە لەوە ناگرێت ڕێکاری یاسایی دیکە بەرامبەر بە سەرپێچکار بگیرێتەبەر ئەگەر سەرپێچییەکی دیکەی کردبێت و سزاکەی لە یاسایەکی دیکەدا دەقنووسکرابێت.

# بەشی یەکەم
# ئەرکەکانی وەزارەت

**ماددەی (150):**

وەزارەت لە ڕێگەی ئەم ڕێکارانەی خوارەوە، هەوڵی گەیشتن بە ئامانجە گشتی و هاوبەشەکانی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن دەدات:-

**یەکەم:** داڕشتنی سیاسەتی پەروەردەیی و فێرکردن و جێبەجێکردنیان.

**دووەم**: جێبەجێکردن و بەدواداچوون بۆ ئەو ئەرکانەی لەم یاسایەدا هاتوون.

**سێیەم**: چەسپاندنی بنەمای گشتی فێرکردنی بەرمەبنای دابینکردنی هەلی پەروەردەیی و فێرکاریی گونجاو.

**چوارەم**: کارکردن بۆ دابینکردنی دڵنیایی جۆریی و بەستنەوەی بە ڕێکاری سەرپەرشتیکردنی هەموو دامەزراوە پەروەردەییە حکومیی و ناحکومییەکان.

**پێنجەم**: دروستکردن، دامەزراندن و بەڕێوەبردنی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان بە هەموو قۆناغ و جۆرەکانیان و پارێزگاریکردن لە سەربەخۆییان و دابینکردنی هەموو پێداویستیەکانی بەگەڕکەوتن و بەردەوامبوونی کارەکانیان.

**شەشەم**: دابینکردنی هۆکارەکانی فێرکردن و تەکنیکە پێویستە پەروەردەییەکان بۆ کاری پەروەردە و فێرکردن.

**حەوتەم**: دیاریکردنی بنەما و پێوەرە گشتییەکانی گەشەپێدانی پرۆسەی فێرکاریی.

**هەشتەم**: دانان و نوێکردنەوەی پلانی فێرکردن و پروگرامەکانی خوێندن، بە سوود وەرگرتن لە پێشکەوتنەکانی ئەو بوارە.

**نۆیەم**: گرنگیدان بە توێژینەوەی پەروەردەیی و ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی جیاواز و سوودوەرگرتن لە ئەنجامەکانیان بۆ گەشەپێدانی پرۆسەی فێرکاریی.

**دەیەم**: خوێندنەوە و دانانی ڕێگە و هۆکاری گونجاو بۆ بەرەوپێشبردنی خوێندنی ئەکادیمی و پیشەیی و کارکردن لەسەر گەشەپێدانیان.

**یازدەیـەم**: گرنگیـدان بـە گەشـەکردن و بەرەوپێشـچوونی توانسـتە پیشەیی و زانستییەکانی کارمەندە پەروەردەییەکان.

**دوازدەیـەم**: گرنگیـدان بە چالاکیی وەرزشـی و هونەری لـە دامەزراوە پەروەردەیی و فێرکارییەکان.

**سـێزدەیەم**: گرنگیدان بە لایەنـی دەروونیی قوتابیـان و خوێندکاران، دابینکردنـی خزمەتگوزاریـە تەندروسـتییەکان، توێژینـەوەی کۆمەڵایەتـی، دڵنیابـوون لـە تەندروسـتی و سـەلامەتی قوتابـی و خوێنـدکاران و سـەلامەتی ژینگـەی دامـەزراوە پەروەردەیـی و فێرکارییەکان.

**چواردەیـەم**: ئامادەکردنـی پلانـی نیشـتمانی سەرتاسـەریی بـۆ نەهێشتنی نەخوێندەواریی.

**پازدەیـەم**: هاندانـی پتەوکردنـی پەیوەنـدی لـە نێـوان دامـەزراوە و کەسـوکاری قوتابـی و خوێنـدکاران، لـە ڕێگـەی بەهێزکردنـی ڕۆڵـی ئەنجومەنی بەخێوکاران.

**شـازدەیەم**: کارکـردن بـۆ هاندانـی وەبەرهێنـان لـە بـواری پـەروەردە و فێرکاریـی لەلایـەن کەرتـی تایبـەت و فراوانکردنـی چوارچێـوەی هاوکاری لەگەڵیاندا، سـەبارەت بە جێبەجێکردنـی ئەو بەرنامە و پڕۆژە پەروەردەییانەی ئامانجیان بەهێزکردنی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنە.

**حەڤدەیـەم**: گرنگیـدان بـە پەیوەنـدی لەگـەڵ دامەزراوە نیشـتمانی و نێودەوڵەتییـەکان و ئاڵوگـۆڕی بۆچـوون لـە بـوارە جۆراوجۆرەکانـی پـەروەردە و فێرکـردن و نوێنەرایەتیکردنـی هەرێـم لـەو کۆنگـرە و کۆبوونـەوە و ڕێکخـراو و کـۆڕە هەرێمـی و نێودەوڵەتییانـەی، کـە ئامانجی پەروەردەیی و فێرکارییان هەیە.

**هەژدەیـەم**: هـەر ئەرکێکـی پەروەردەیـی و فێرکردنـی دیکـە، کـە ئەنجومەنی وەزارەت پەسەندی دەکات.

## بەشی دووەم
## پێکهاتە و ئەنجومەنی وەزارەت

---

## تەوەری یەکەم
## پێکهاتەکانی وەزارەت

**ماددەی (151):**

**یەکەم**:

1 - وەزیر: سەرۆکی باڵای وەزارەتە و بەرپرسی کارەکانیەتی و ئاراستەکاری پلانەکانیەتی و سەرپەرشتیکار و چاودێرە بەسەریەوە، بە بڕیار و سەرپەرشتیی خۆی و بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە، سەرجەم ئەو بڕیار و فەرمان و ڕێنماییانە دەردەچن، کە پەیوەندییان بە ئەرک و پێکهاتە و دەسەڵات و هەموو کاروبارە هونەری و دارایی و کارگێڕیی و ڕێکخستنەکانی وەزارەتەوە هەیە، وەزیر وەک ئەندامێک لە ئەنجومەنی وەزیران لە بەردەمیدا بەرپرس دەبێت.

2 - نووسینگەی وەزیر: کە لەلایەن فەرمانبەرێکەوە بەڕێوەدەبرێت، کە بڕوانامەی بەرایی زانکۆی هەیە و چەند فەرمانبەرێکی دیکە یارمەتیدەدەن.

**دووەم**:

1 - بریکاری وەزارەت: وەزارەت یەک بریکاری دەبێت، لە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتانەی وەزیر پێیدەدات، یارمەتی وەزیر دەدات لە ڕاییکردن و سەرپەرشتیکردنی کاروباری وەزارەتدا.

2 - نووسینگەی بریکاری وەزارەت: لەلایەن فەرمانبەرێکەوە بەڕێوەدەبرێت، کە بڕوانامەی بەرایی زانکۆی هەیە و چەند فەرمانبەرێکی دیکە یارمەتیدەدەن.

**سێیەم**: وەزارەت ژمارەیەک ڕاوێژکاری دەبێت، کە ژمارەیان لە (5) پێنج

زیاترنابێت و ئەو ئەرکانە جێبەجێدەکەن، کە وەزیر بەپێی پێداویستی وەزارەت پێیان دەسپێرێت، دەبێت هەریەکەیان خاوەن بڕوانامەی بەرایی زانکۆ بن و ئەزموونیان لە بواری پەروەردە و فێرکاریی لە (15) پازدە ساڵ کەمتر نەبێت.

**چوارەم**: بەڕێوەبەرە گشتیەکانی ناو وەزارەت و پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکان.

**ماددەی (152):**

**یەکەم**: ئەم بەڕێوەبەرایەتیە گشتیانەی خوارەوە لە وەزارەت دەبن:-

1 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی دیوان.

2 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی باخچەی منداڵان و فێرکردنی بنەڕەتی.

3 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی فێرکردنی ئامادەیی و پیشەیی.

4 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەیمانگەکان.

5 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن.

6 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی تاقیکردنەوەکان و ساڵنامەی خوێندن .

7 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرامەکانی خوێندن.

8 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پلاندانانی پەروەردەیی.

9 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی فێرکردنی تورکمانی.

10 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی فێرکردنی سریانی.

11 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی وەرزش و هونەر.

12 - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی بیناسازیی.

13 - بەڕێوەبەرایەتی گشتیی فێرکردنی ناحکومی.

**دووەم**: لە گشت پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکانی هەرێم بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەروەردە دەبێت.

**سێیەم**: هەر یەک لەو بەڕێوەبەرایەتییە گشتییانەی لە بڕگەکانی (یەکەم) و (دووەم) ی ئەم ماددەیەدا هاتوون، لەلایەن فەرمانبەرێکەوە بە پلەی بەڕێوەبەری گشتی بەڕێوەدەبرێن، کە دەبێت بڕوانامەی بەرایی زانکۆی هەبێت و ئەزموون و خزمەتیشی

لـە بـواری پـەروەردە و فێرکردن، یاخود بـواری ئەکادیمی لـە (10) دە ساڵ کەمتر نەبێت.

**چوارەم**:

1 - ئـەرک و دەسـەڵاتی پێکهاتەکانـی وەزارەت بـە پەیڕەوێـک ڕێکدەخرێت، کە ئەنجومەنی وەزیران دەریدەکات.

2 - ئەنجومەنی وەزیران دەتوانێت لە کاتی پێویستدا، بەڕێوەبەرایەتییە گشـتییەکانی هاتـوو لـە بڕگەی (یەکـەم)ی ئـەم ماددەیەدا لەسـەر پێشنیاری وەزارەت، لێکبدات، یان تێکەڵ بکاتەوە.

**ماددەی (153)**

**یەکـەم**: وەزیر مافی هێنانەئـارا، یان لێکدان، یان هەڵوەشـاندنەوە، یان گواستنەوەی بەڕێوەبەرایەتی، یان بەش، یان هۆبەی هەیە.

**دووەم**: پێکهاتـەی نووسـینگە و بەڕێوەبەرایەتییـەکانی وەزارەت و ئەرکەکانیـان لە ڕێگـەی پەیڕەوێکی ناوخـۆ، کە وەزیر بـە ڕەچاوکردنی حوکمەکانی ئەم یاسایە دەریدەکات، ڕێکدەخرێت.

## تەوەری دووەم
## ئەنجومەنی وەزارەت

**ماددەی (154):**

**یەکـەم**: ئەنجومەنێـک بـە نـاوی (ئەنجومەنـی وەزارەتـی پـەروەردە) پێکدێت، بە سەرۆکایەتی وەزیر و ئەندامیەتی هەر یەک لە:-

1 - بریکاری وەزارەت.

2 - ڕاوێژکارەکانی وەزارەت.

3 - بەڕێوەبەرە گشتییەکان.

**دووەم**: بەڕێوەبـەری نووسـینگەی وەزیـر سـکرتێری ئەنجومـەن دەبێـت، کارەکانـی ڕێکدەخـات، کۆنووسـی کۆبونـەوەکان تۆمـار دەکات و بڕیارەکانی ئەنجومەن بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکان، دەنێرێت.

**ماددەی (155)**: ئەرکەکانـی ئەنجومەنی وەزارەتی پەروەردە پێکدێت لە:-

**یەکـەم**: داڕشـتنی پلانـی کاری وەزارەت و بەدواداچـوون بـۆ جێبەجێکردنی لەبەر ڕۆشنایی ئامانجەکانی ئەم یاسایە.

**دووەم**: گرتنەبـەری بڕیـاری پێویسـت سـەبارەت بـە بەڕێوەچوونـی پرۆسەی پەروەردە و فێرکاریی.

**سـێیەم**: بڕیـاردان لـە سـاڵنامەی خوێنـدن و چەسـپاندنی ڕۆژە پشووەکانی خوێندن.

**چـوارەم**: ئامادەکردنـی پێشـنیازی بودجـەی سـاڵانەی وەزارەت و پێکهاتەکانی و ڕاستاندنی ڕاپۆرتی ژمێرەی کۆتایی.

**پێنجەم**: دانانی ئەرکە لەپێشـینەکان و ڕێسـا گشتییەکان، بۆ پێدانی مۆڵەتی خوێندن و شاند و زەمالەکان.

**شەشەم**: بڕیاردان لە ڕەشنووسی ڕێنماییەکان و هەموارکردنەوەیان.

**حەوتەم**: کارکردن بۆ دابینکردنی دڵنیایی جۆریی.

**هەشـتەم**: پێشـنیاری هەموارکردنـەوەی یاسـای پـەروەردە و

ئاراستەکردنی بۆ ئەنجومەنی وەزیران.

**نۆیەم**: گفتوگۆکردن و بڕیاردان لە ڕاپۆرتی ساڵانەی کارەکانی وەزارەت.

**دەیەم**: تاوتوێکردنی ڕاپۆرتی ساڵانەی بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکانی پەروەردە.

**یازدەیەم**: هەر ئەرکێکی دیکە کە لەم یاسایەدا هاتووە و هەر کارێک کە وەزیر لەبەر ڕۆشنایی حوکمەکانی ئەم یاسایەدا بە پێویستی دەزانێت، کە ئەنجومەن تاوتوێی بکات و بڕیاری لێبدات.

**ماددەی (156):**

**یەکەم**: ئەنجومەن کۆبوونەوەی مانگانەی دەبێت و دەتوانێت لە کاتی پێویستدا کۆبوونەوەی دیکە لەسەر داوای سەرۆک بکات، بڕیارەکانی بە ئامادەبوونی زۆرینەی ئەندامەکانی دەدرێت، جگە لە دەنگدان لەو پرسانەی کە بەپێی یاسا تەنها لە دەسەڵاتی وەزیرە.

**دووەم**: سەرۆکی ئەنجومەن، مافی بانگهێشتکردنی پسپۆڕان و کەسانی پەیوەستداری بۆ کۆبوونەوەکان هەیە، بەبێ ئەوەی مافی دەنگدانیان هەبێت.

## بەشی سێیەم
## ئەنجومەنی پەروەردە لە پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکان

## تەوەری یەکەم
## پێکهاتە و کۆبوونەوەکان

**ماددەی (157):**

**یەکەم**: لەهەر بەڕێوەبەرایەتییەکی گشتیی پەروەردە لە پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکان، ئەنجومەنێک پێکدێت، بە سەرۆکایەتی بەڕێوەبەری گشتی و ئەندامیەتی هەر یەک لە:

1 - یاریدەدەرانی بەڕێوەبەری گشتی.

2 - بەڕێوەبەرەکانی پەروەردە لە سنووری پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکان.

3 - بەڕێوەبەری دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن.

**دووەم**: دەکرێت کەسانی پسپۆر بۆ کۆبونەوەکانی ئەنجومەن بانگێشت بکرێن، بێ ئەوەی مافی دەنگدانیان هەبێت.

**سێیەم**: نوێنەری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان، مافی ئامادەبوونی لەو کۆبوونەوانە هەیە، کە پەیوەستن بە پرسی مامۆستایان، بێ ئەوەی مافی دەنگدانی هەبێت.

**چوارەم**: لە کاتی ئامادەنەبوونی سەرۆکی ئەنجومەن لە کۆبوونەوەکان، پێشوەختە مافی دستینشانکردنی جێگرەوەیەکی بۆ بەڕێوەبردنی کۆبونەوەکە هەیە.

**پێنجەم**: کۆبوونەوەی ئەنجومەن لانیکەم مانگێ جارێک دەبێت، هەر کاتێکیش پێویست بوو دەتوانێت کۆبوونەوە بکات، بڕیارەکانی ئەنجومەن بە دەنگی زۆرینە دەبێت، جگە لە دەنگدان لەو پرسانەی

که تەنها لە دەسەڵاتی بەڕێوەبەری گشتییە.
**شەشـەم**: بەڕێوەبـەری گشـتی بڕیاردەرێـک بـۆ ئەنجومـەن لـە نێو فەرمانبەرانـی پـەروەردە دیاریـدەکات، کـە دەبێت بڕوانامـەی بەرایی زانکـۆی هەبێـت و لـە تۆمارکردنـی کۆنووسـی کۆبوونـەوەکان و گشتاندنیان بەرپرس دەبێت.

## تەوەری دووەم
## ئەرکەکانی ئەنجومەنی پەروەردە لە پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکان

**ماددەی (158):**
**یەکـەم**: جێبەجێکـردن و بەدواداچوونـی ئـەو پـلان و پرۆژانـەی، کـە وەزارەت لـە سـنووری پارێـزگا و ئیـدارە سـەربەخۆکە دایڕشـتووە و کارکـردن بـۆ دڵنیایی لـە جێبەجێکردنی پـرۆژەکان و پێشکەشـکردنی ڕاپۆرتی وەرزی لە بارەیانەوە بە وەزارەت.
**دووەم**: گفتوگۆکـردن دەربـارەی کێشـە پەروەردەیـی و فێرکاریـی و کارگێڕیـی و هونەرییەکان لە سـنووری بەڕێوەبەرایەتییە گشـتییەکە و بەدواداچوون بۆ ئاسـتەکانی خوێندن و پرسـی دڵنیایی جۆریی، لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەنجومەندا.
**سـێیەم**: ڕووانیـن لـەو پرسـانەی، کـە بەڕێوەبەرایەتیی پـەروەردەی قەزاکانی پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆکان دووچاری دەبن.
**چـوارەم**: پێشـنیارکردن بـۆ وەزارەت سـەبارەت بـە دامەزراندنـی بەڕێوەبەری پەروەردەی قەزا، کە پشـت بە پێشـنیازی لیژنەی پسپۆر دەبەستێت.
**پێنجـەم**: پێشـنیارکردن بـۆ وەزارەت سـەبارەت بـە دابەشـکردنی

فەرمانبەران و گشــت کارمەندانی دیکە بەسەر بەڕێوەبەرایەتییەکانی پەروەردە لە ناوەندی پارێزگا و قەزاکانی.

**شەشــەم**: پێشــنیارکردنی ئاڕاســتە گشــتییەکانی پلانــی پــەروەردە و فێرکــردن لــە ســنووری کاری ئەنجومەنەکــە و ئاراســتەکردنی بــۆ وەزارەت.

**حەوتەم**: پێشنیارکردنی دابەشکردنی بودجەی بەڕێوەبەرایەتییەکانی ناوەندی پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆ و قەزاکان، و پێداچوونەوە بەسەر ڕاپۆرتی ژمێرەی کۆتایی.

**هەشتەم**: بەرزکردنەوەی پێشنیاز بۆ وەزارەت سەبارەت بەو پرسانەی کــە دەتوانــن ببنــە هــۆی باشــترکردنی بەڕێوەچوونــی کاروبارەکانــی پەروەردە و فێرکردن بە شێوەیەکی گشتی.

**نۆیەم**: پێشــنیازکردنی کردنەوەی قوتابخانەی نوێی حکومی، یاخود داخستنیان، بەگوێرەی پێداویستیەکانی بەرژەوەندیی گشتی.

**دەیەم**: هەر ئەرکێکی دیکە کە لەلایەن وەزارەتەوە دەخرێتە ئەستۆی ئەنجومەنی پەروەردەی پارێزگا.

## بەشی چوارەم
## ئەنجومەنی پەروەردە لە قەزاکان

---

## تەوەری یەکەم
## پێکهاتە و کۆبوونەوەکان

**ماددەی (159):**

**یەکەم**: دەبێت لە هەر قەزایەک بەڕێوەبەرایەتییەکی پەروەردە هەبێت.

**دووەم**: لـە بەڕێوەبەرایەتییەکانی پەروەردەی قـەزاکان، ئەنجومەنێک بـە ناوی ئەنجومەنی پەروەردەی قەزا پێکدەهێنرێت، بە سـەرۆکایەتی بەڕێوەبەری پەروەردەی قەزا و ئەندامیەتی هەر یەک لە:

1 - سەرپەرشتیاری پەروەردەیی یەکەمی قەزا.

2 - بەڕێوەبەری دڵنیایی جۆریی و سەرپەرشتیکردن.

**سێیەم**: نوێنەری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان مافی ئامادەبوونی لـەو کۆبوونەوانـە هەیـە کە پەیوەسـتن بە پرسـی مامۆسـتایان، بێ ئەوەی مافی دەنگدانی هەبێت.

**چـوارەم**: بەڕێوەبـەر بڕیاردەرێـک بـۆ ئەنجومـەن لەنێـو فەرمانبەرانـی پـەروەردە دیاریـدەکات، کە دەبێـت بڕوانامەی بەرایـی زانکۆی هەبێت و بەرپـرس دەبێـت لـە تۆمارکردنـی کۆنووسـی کۆبوونـەوەکان و گشتاندنیان.

**پێنجـەم**: کۆبوونـەوەی ئەنجومـەن لانیکـەم مانگـی جارێکـە و هـەر کاتیـش پێویسـت بـوو دەتوانێـت کۆبوونـەوە بـکات، بڕیارەکانـی ئەنجومەن بە دەنگی زۆرینە دەبێت، جگە لە دەنگدان لەو پرسانەی کە تەنها لە دەسەڵاتی بەڕێوەبەرە.

**شەشـەم**: دەکرێـت خەڵکانی پسـپۆر بۆ کۆبوونەوەکانـی ئەنجومەن بانگهێشـت بکرێـن لە کاتی پێویسـت، بێ ئەوەی مافـی دەنگدانیان هەبێت.

## تەوەری دووەم
## ئەرکەکانی ئەنجومەنی پەروەردە لە قەزا

**ماددەی (160):**

**یەکەم**: جێبەجێکردن و بەدواداچوونی ئەو پلان و پرۆژانەی کە وەزارەت لە سنووری قەزا دایڕشتووە و کارکردن بۆ دڵنیایی لە جێبەجێکردنیان و پێشکەشکردنی ڕاپۆرتی وەرزیی لە بارەیانەوە بە ئەنجومەنی پەروەردە لە پارێزگا.

**دووەم**: گفتوگۆکردن لەسەر کێشە پەروەردەیی و فێرکاریی و کارگێڕیی و هونەرییەکان لە سنووری قەزاکە و بەدواداچوون بۆ ئاستەکانی خوێندن و پرسی دڵنیایی جۆریی.

**سێیەم**: پێشنیازکردن بۆ وەزارەت سەبارەت بە دامەزراندنی بەڕێوەبەری دامەزراوەی پەروەردەیی و فێرکردن و گشت کادیرانی دیکەی دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان لە قەزاکان پشتبەست بە پێشنیازی لیژنەی پسپۆر.

**چوارەم**: بەرزکردنەوەی پێشنیاز بۆ ئەنجومەنی پەروەردەی پارێزگا، سەبارەت بە ئاڕاستە گشتییەکانی پلانی پەروەردە و فێرکردن لە قەزا و ئەو پرسانەی کە دەتوانن ببنە هۆی باشکردنی بەڕێوەچوونی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن بە شێوەیەکی گشتی.

**پێنجەم**: بەرزکردنەوەی پێشنیاز بۆ ئەنجومەنی پەروەردەی پارێزگا سەبارەت بە دامەزراندنی قوتابخانەی حکومی نوێ، یاخود داخستنیان، بەپێی پێداویستیەکانی بەرژەوەندیی گشتی.

**شەشەم**: هەر ئەرکێکی دیکە کە لەلایەن ئەنجومەنی پەروەردەی پارێزگا، یان ئیدارەی سەربەخۆ بە ئەنجومەنی پەروەردەی قەزا دەسپێردرێت.

# بەشی یەکەم
# حوکمە داراییەکان

## تەوەری یەکەم
## داهاتەکانی وەزارەت

**ماددەی (161):** داهاتەکانی وەزارەت پێکدێت لە:-
**یەکەم**: بەشە بودجەی وەزارەت لە بودجەی گشتیی هەرێم.
**دووەم**: داهاتی فرۆشگاکانی دامەزراوە پەروەردەیی و فێرکارییە حکومییەکان.
**سێیەم**: یارمەتی و دیاری و بەخشین و ئەو سپاردانەی کە دەدرێت بە وەزارەت بەمەبەستی دروستکردنی تەلاری دامەزراوەی پەروەردەیی و فێرکاریی یان گەشەپێدانیان، یان فراوانکردنیان، یاخود نۆژەنکردنەوەیان، یان دابینکردنی پێداویستیەکانیان.
**چوارەم**: هەر داهاتێکی دیکە کە بۆ وەزارەت و دامودەزگاکانی، بەپێی یاسا بەرکارەکانی هەرێم، دادەنرێت.

**ماددەی (162):**
ئەو بابەت و کەرەستە و ئامێرانەی کە وەزارەت بەمەبەستی پەروەردە و فێرکردن هاوردەی دەکات، یاخود ئەوانەی بۆ ئەو مەبەستە بە وەزارەت دەبەخشرێن، لە ڕەسمە گومرگیەکان دەبەخشرێن.

**ماددەی (163):**
وەزارەت، لە ڕێگەی ڕێنماییەوە کە وەزیر دەریدەکات، مافی وەرگرتنی ڕەسمی لەو کار و خزمەتگوزاریانەی خوارەوەدا هەیە:-
**یەکەم**: هاوتاکردنی بڕوانامەکان.
**دووەم**: وردبینیکردنی بەڵگەنامەکان و وەرگێڕانیان.
**سێیەم**: وێنەی زیادەی بەڵگەنامەکان.

**چـوارەم**: ڕسـوماتی پێدانـی مۆڵـەت و نوێکردنـەوەی مۆڵـەت، گواسـتنەوەی دامـەزراوەی پەروەردەیـی ناحکومـی، ناوگۆڕینـی دامـەزراوە و ئەو خزمەتگوزاریانەی دیکە، کە پەیوەندیان بە دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکانەوە هەیە.

**پێنجەم**: بەشداربوون لە تاقیکردنەوە دەرەکییەکان.

**ماددەی (164):**

**یەکـەم**: هـەر کەسـێک دامەزراوەیەکـی پەروەردەیـی و فێرکـردن بـێ بەرامبەر دروسـت بـکات و بیبەخشـێت بـە وەزارەت، لـە بڕێکی بـاج دەبەخشرێـت کـە هاوتـای (20 %) بیسـت لە سـەدی تێچووی دروستکردنی دامەزراوەکە بێت.

**دووەم**: دامەزراوەی پەروەردەیی ناحکومی قازانج نەویسـت، مافی لێخۆشبوونی لە باج بەپێی یاسا بەرکارەکان، هەیە.

**ماددەی (165):**

ئەو ڕەسم و کرێ و پێبژاردنە کارگێڕییانەی کە وەزارەت وەریاندەگرێت، بـۆ دروسـتکردن، یـان نۆژەنکردنـەوەی تـەلاری قوتابخانـە، یـان پێداویسـتیی دامـەزراوە پەروەردەییـە حکومییـەکان، یـان ڕاهێنـانی مامۆستایان و فەرمانبەران، یاخود پاداشتکردنیان، تەرخاندەکرێنەوە.

**ماددەی (166):**

دامـەزراوە پەروەردەیـی و فێرکارییـەکان، دەتوانـن یارمەتـی دارایی و بەخشـینەکان وەربگرن، بە مەرجێک لەژێر چاودێری و وردبینی دارایی و بەپێی ڕێنماییەکانی وەزارەت بێت.

## تەوەری دووەم
## حوكمە گشتییەكان

**ماددەی (167):**

وەزارەت مافی ناردنی نێردەی زانستی بۆ دەرەوەی هەرێم و پێشوازیكردنی نێردەی زانستی لە دەرەوەی وڵات هەیە، بەپێی یاسا و ڕێنماییە بەركارەكان.

**ماددەی (168):**

**یەكەم**: شكۆی دامەزراوە پەروەردەیی و فێركارییەكانی هەرێم، لە سنووری یاسادا پارێزراوە، نابێت هێزەكانی ئاسایشی ناوخۆ بەبێ پرس بچنە ناو حەرەمیان، تەنها لەو بارەدا نەبێت كە تاوانێكی بینراو هەبێت، یان لەسەر داوای بەڕێوەبەری دامەزراوەكە، یاخود پشتبەست بە فەرمانی دادوەر بێت.

**دووەم**: دەستدرێژیكردن بۆ سەر مامۆستا لە كاتی جێبەجێكردنی ئەركەكەی، یاخود بەهۆی وەزیفەكەیەوە، بە باری توندكاری سزای دەستدرێژیكردنە سەر فەرمانبەری دەوڵەت دادەنرێت.

**ماددەی (169):**

**یەكەم**: دامەزراوە پەروەردەییە حكومییە پەیوەندیدارەكان، لە پارێزگا و ئیدارە سەربەخۆكان، زەوی پێویست بۆ دروستكردنی باخچەی منداڵان و قوتابخانە و پەیمانگە پەروەردەییە پیشەییەكان و ناوەندەكانی پەروەردە و فێركردنی دیكەی حكومی تەرخاندەكەن.

**دووەم**: ئەگەر زەوی پێویست بەپێی حوكمەكانی بڕگەی (یەكەم) ی ئەم ماددەیە تەرخان نەكرا، وەزارەت بۆی هەیە بە هەماهەنگی لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەكان، دوای ڕەزامەندی ئەنجومەنی وەزیران، زەوی گونجاو بكڕێت، یان بە موڵك بكرێتە سەر وەزارەت و لەسەر تێچووی حكومەت، بێ ئەوەی كاریگەری لەسەر بودجەی وەزارەت هەبێت.

**سێیەم**: ئەو زەویانەی دامەزراوەی پەروەردەیی حکومییان لەسەر بنیاتنراوە، یان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کراون، بە ناوی وەزارەت تۆمار دەکرێن.

**ماددەی (170):**

بڕی ڕەسمی ئەو خزمەتگوزارییە گشتییانەی کە وەزارەت پێشکەشی دەکات، بە پەیڕەوێک دیاریدەکرێت، کە ئەنجوومەنی وەزیران دەریدەکات.

**ماددەی (171):**

پێویستە لایەنە پەیوەندیدارەکان حوکمەکانی ئەم یاسایە جێبەجێبکەن.

**ماددەی (172):**

پێویستە وەزیر ڕێنمایی پێویست بۆ ئاسان جێبەجێکردنی حوکمەکانی ئەم یاسایە دەربکات.

**ماددەی (173):**

**یەکەم**: یاسای وەزارەتی پەروەردە ژمارە (4)ی ساڵی (1992)ی هەموارکراو هەڵدەوەشێتەوە.

**دووەم**: یاسای قوتابخانە و پەیمانگە ناحکومیەکانی هەرێمی کوردستان - عێراق ژمارە (14)ی ساڵی (2012) هەڵدەوەشێتەوە.

**ماددەی (174):**

کار بە دەقی هیچ یاسا، یان بڕیارێک ناکرێت، کە لەگەڵ حوکمەکانی ئەم یاسایەدا ناکۆک بێت.

**ماددەی (175):**

**یەکەم**: ئەرکی وەزارەتە، پێش دەسپێکی نزیکترین ساڵی خوێندن دوای دەرچوونی ئەم یاسایە، دامەزراوە پەروەردەییە حکومییەکان بە جۆرێک ڕێکبخات، کە لەگەڵ حوکمەکانی ئەم یاسایەدا هاوتابێت.

**دووەم**: ئەرکی گشت دامەزراوە پەروەردەییە ناحکومییەکانە، پێش دەسپێکی نزیکترین ساڵی خوێندنی دوای دەرچوونی ئەم یاسایە،

